ساعدت الأمانة العامة للثقافة والشباب لمنطقة كردستان على طبعه



# هه‌ڵبژارده‌یه‌ك

## «له‌عه‌قیده‌ مه‌رضیه‌ی»

# مه‌وله‌وی

## لێكدانه‌وه‌و لێكۆڵینه‌وه‌ی

## بابه‌علی شێخ عمر قه‌ره‌داخی

١٤٠٤ ك — ١٩٨٥ ز

ئەمانەتی گشتی رۆشنبیری؛ لاوان یارمەتی لەچاپ دانی داوە

هەڵبژاردەیەك لە (عەقیدە مەرضیە)ی

# مـەولـەوی

لێكدانەوەو لێكۆڵینەوەی

## بابە علی شێخ عمر قەرەداخی

١٤٠٥ك ـ ١٩٨٥ز

چاپخانەی ئیرشاد ـ بەغدا

# کورتەیەك لە ژیانی مەولەوی

ڕۆژێ لـە ڕۆژانی ساڵی (١٢٢١)ی کۆچیی ، لە دێی (سەرشاتە)ی دوور لە ئاوەدانیی ، لە ناوچەی ( تاوگۆزی )ی بەشی عێراق ، خونچە یەکی‌تر لە بنەماڵەیەکی ڕەسەن‌و بەڕێز چاوی هەڵهێنا .

ئـەم خونچە سەیید ( عبدالرحیم )ی کوڕی مـەلا ( سعید ) بوو کە لـە ڕەگەزدا ئەچێتەوە سەر زانای گەورە مـەلا ( ابو بکر )ی چـۆڕیی بـەنـاوبانگ بـە ( مصنّف ) .

پاش ماوەیەك باوکی بـە مەلایەتیی ئەچێتە دێی ( بێژاوا )و سەیید ( عبدالرحیم )یش ، سەردەمی خوێندنی دێ‌و لای باوکی دەست ئەکا بـە سەرەتای خوێندن‌و نووسین‌و ، قورئانی پیرۆز تەواو ئەکاو گەلێ لە کتێبە سەرەتاییەکانیشی لا ئەخوێنێ ، ئەنجا لـە سـەر نەریتی ئەو سەردەمە ئەکەوێتە گەڕان بـە قوتابخانـە ئاینییەکانـی کوردوستانداو لـە هـەر گوڵزارێ گوڵێ‌و لـە هـەر باخێ میوەیێ ئەکاتەوە ، تا لـە بەرهەمی زانایانی سەردەم مەست ئەبێ‌و لـە کۆتاییدا لای ، زانای بەناوبانگ مـەلا ( عبدالرحمان )ی نۆتشیی ، موفتی سلەیمانیی‌و مامۆستای مزگـەوتی مەلکەندیی ئەگیرسێتەوەو تاجی سەر گەنجنەکـەی لا بـەدەست دێنێ‌و ئیجازەی زانیاریی لێ وەرئەگرێ .

لـە پاشا لە دێی ( چرۆسانە ) قوتابخانەیەك بۆ خۆی پێکەوە ئەنێ‌و ماوەیەك سەرقاڵی وانەوتنەوەی زانارییە ئاینیی‌و ئـەدەبییەکان ئەبێ ، چەند دێیەکی تریش ئەکا ، تا لـە ( شەمێران ) ئەگیرسێتەوە ، لـە

سەردەمی سەرکاریی شێخ عەلیی عەبابەیلێیدا ماوەیەکی تێدا بە خۆشیی بەسەرئەبا ، کار ئەگۆڕێو ( عثمان )ی خاڵە ئەبێ بە سەرکارو ناڵەباریی بەرانبەر خزمو کەسەکانی مەولەویی دەرئەبڕێ ، ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ ( سەرشاتە )و لەگەڵ ئەو هەموو بوارانەی لە ڕێداهەبوو ، ماوەی تەمانی لەگەڵ خزمەکانیدا بە هەژارییو نەفس بەرزیی بەسەرئەبا .

لە کۆتاییی ژیانیدا تووشی ژنمردنو کوردیی کردووە . هەر بەسۆزترین لاواندنەوەی پێشکەش بەئەدەبی کوردیی کردووە . هەر وەها کتێبخانەکەشی سووتاوەو گەلێ لە کتێبو دەستنووسەکانی تێداچووە ، بەم بۆنەیەوە چامەیەکی تێجگار دڵگیری وتووە .

هەرچەند لەوە ئەچێ گەلێ شیعرو چامەی بەنرخی تێدا چووبێ لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە شیعرەکانی لای ئێمەو ئەو ماونەتەوە سامانێکی یەکجار بەنرخن لە جیهانی ئەدەبو شیعردا .

شاعیرێتیی سەید ( عبدالرحیم ) ئەگەڕێتەوە سەردەمی لاوییو فەقێیەتیی ؟ ئەو نامانەی بۆ شێخ (عزیز)ی جانەوەرەیی لەم سەردەمەدا، نووسیوە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاوێنەیەکی باڵانمان بۆ زوو ڕەسەنیی ئەو بەهرە شیعرییە ڕەسەنو سەرکەوتووە .

لە سەردەمی مەلایەتیدا خولیا سۆفیگەرییو وەرزشی گیانیی ئەکەوێتە سەرییو بەرەو تەوێڵە بۆلای ڕابەری پایەبەرز شێخ (عثمان)ی (سراج‌الدین) ئەکشێو پەیوەندییەکی گیانیی لەگەڵدا ئەبەستێ ، واتای سۆفیگەریی تێکەڵ بەگۆشتو خوێنی ئەبێو ئەچێتە بارو دۆخێکی ترەوە .

ئەم دیاردە لە شیعرەکانیدا ڕەنگ ئەداتەوەو ڕێبازێکی نزیك لە ڕێبازی مەولانای ڕۆمیی پێ ئەگرێ ، هەر لەبەر هەستکردن بەم

لێکچوو ەبووە ، غولام شاخانی والی‌ی سنە ـ کە لە سەردەمادا بەهۆی جیاوازی‌ی مەزهەبییەوە ناحەزی سەییە (عبدالرحیم) بووەو بە ناچاری‌ی دوای دەرکەوتنی بەهرەی بێوێنەی ویستوویەتی بۆسوود وەرگرتن لە بەهرەکەی خۆی لێ‌نزیك کاتەوە ـ لە ئاهەنگێکدا بەم بۆنەوە سازی کردبوو نازناوی (مەوەوی‌ی)ای بە شێوەیەکی ڕەسمی‌ی پێشکەشی سەیید (عبدالرحیم)کردو ، لەو سەردەمەوە زیاتر لە هەموو نازناوێ بە مەولەوی‌ی ناسراوە ، ئەمە سەبارەت بە (مەولەوی‌ی) ئەو نازناوەی کەخۆیشی پەسەندی کردووە : (مەعدووم) هەر لەو ڕێبازە سۆفیگەرییەوە هاتووە •

ڕۆژێ لە ڕۆژانی سالی (١٣٠٠)ی کۆچی‌ی کە لە پرسەی دۆستێکی لە (بریس)ەوە ئەگەڕایەوە ، لە سەر ڕێگەکەیدا نزیك لە (هانەسوورە) توویەك لقی‌شۆڕ بووبوەو جلەوکێشەکەی ئامۆژگاریەکەی لە بیر چوو کە ئاگاداری کاتەوە تا لەو ئاستەدا سەردانەوێنێ ، لقەدار بە سنگی بێخەوشی مەولەوییدا ئەداو لە ئەسپەکەی ئەکەوێتە خوارێو پشتی ئەشکێ ، لە ئەنجامدا ئەوکۆگای زانستو ئەدەبو خوداناسیەش خاك ئەی شارێتەوە ، سەد ڕەحمەت لە گۆڕی خاوێنی‌و درووودی بێ‌پایان لە گیانی پاکی‌ی •

# به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

خولیای ئـەم لێکۆڵینەوەم چۆن کەوتەسەر ؟

دەمێك‌بوو سـەوداسـەری ( العقیدة المرضیه )ی مەولەوی‌ی بووم، حەزم لە بەخت‌کردنی ماوەیەك ئەکرد ، لە خوێندنەوەیەکی وردوو پڕ چەشیدا ، بەڵام پڕ کێشییم نەئەکرد ؛ لەبەر چەند هۆیەك کە هـەندێکیار پەیوەندی‌ی بەخۆمەوە هەبوو ، وەك پەشێوی‌ی دەروونی‌ی‌و جارجاریش بێ‌دەرفەتی‌و سەرقاڵی‌ی‌و سەرپاڵەی هەموویش کاك تەمبەڵی‌ی .

ئەوی تریش بەستەیە بـە کتێبـەکـە خۆیـەوە ، وەك گرانـی‌ی‌و پێچراوەیی‌ی‌و زمانی نووسیین کە تێکەڵە لە چەند شێوەیەك جگە لە بەکار هێنانی‌عەرەبی‌ی وفارسییش هەرچەند بە شێوەیەکی سەرەکی‌ی لەهجەی ناوچەی تاوگۆزی‌ی‌و ئەورۆڵی‌ی تێدا زاڵە .

سەرەڕای هەموویش بەکارهێنانی ڕێنووسی فارسی‌ی لە دەسنووس، چاپە تاقانەکەی خوالێ‌خۆشبوو [ محی‌الدین صبری النعیمی أل ( کانی سکانی ) ]دا ، کە لە ساڵی ( ١٣٥٢ك/١٩٣٤ز )دا لە میسر بە ئەنجامی گەیاندبوو .

زۆر جار ئاواتی ئەوەم ئەخواست شارەزایەك بەڕێنووسی باو لەگەڵ ڕاڤەدا ئەرکی لەچاپ‌دانی بگرتایە ئەستۆو ، ئەو ڕێ سەخت‌و بەردەڵانەی بۆ جەماوەری خوێنەران خۆش‌بکردایە .

ئەوەشم ئەزانی‌ی کە زانای پایەبەرز مامۆستا مـەلا ( عبدالکریم )ی

مودەرپریس ، دەمێکە لە ڕاڤەکردنی بووەتەوە بەتەمای لە چاپدانێتی لە دەرفەتێکدا ، بەڵام تا ئێستە ، لەبەر هەر هۆیەك بێت بۆی ڕێ نەکەوتووە ،

ڕێشی تێ ئەچێ کارەکانی تری بەلاوە گرنگتربووبێ و لەبەر ئەوە مافی پێشترێتیی دابێ ، هەرچەند من سەبارەت بە هەندێکیان بە پێچەوانەوە بیر ئەکەمەوە .

هەر چۆن بێ من حەزم ئەکرد ئەم کارەی ئەلێ زووتر بە ئەنجام بگەیاندایەو هیوای ئەوەشم هەیە ، لەمە زیاتر چیی تر دوای نەخاو خوێنەران بە بینین و خوێندنەوەی چاو ڕوون و دڵخۆش کا .

ئەمە لە لایەك و لەلایەکی ترێشەوە لە سای (١٩٧٨ز)دا نامیلکە یەکم بە سەرناوی : ( مەولەویی و سروشت ) نووسیبوو ، دەزگای : ( کۆڕی زانیاریی کورد ) لە چاپی دابوو ، دوابەدوای ئەویش چەند لێکۆڵینەوەیەکی تریشم سەبارەت بە شیعرەکانی تری مەولەویی نووسیبوو هەر وەکو خۆیان مابوونەوە تا ئیمساڵ کە هاتمە سەر ئەوەی پوختەو پاکنووسیان بکەم بەڵکو لە دەرفەتێکدا بۆم هەڵکەوێ لە چاپیان بدەم .

لە بەرواری : ١-٤-١٩٨٤دا دەستم دایە خامەو گەلێکم لێ پوختەو پاکنووس کردن ، بۆ هەندێ زاراوەو هێمای سۆفیگەریی پێویستم بە لێ گەڕانی چەند سەرچاوەیەك بوو کە گرنگتریان کتێبی : ( العقیدة المرضیة )ی مەولەویی خۆی بو ، لە کاتی ئەم پێچوونەوەمدا ، ڕێم لە گەلێ پارچەی تێجگار ناسك و پڕمێشك و خاوەن هێمای دڵگیر کەوت ، جگە لەوانەی لە دەمی ئەمو ئەوەم بیستبوو بە جۆرێ بێبەروا سەوداسەریان

بووم‌و ئه‌وه‌بوو خولیای ئه‌م کاره‌م که‌وته که‌لله‌ •

سه‌یرم کرد بۆ ئه‌نجامدانی ئه‌م کاره لای که‌می‌ی پێویستیم به‌ ده‌ستنووسێکی متمانه پێکراو هه‌یه ، یه‌که‌م : بۆ ئه‌وه‌ی دڵنیابم له ڕاده‌ی دروستیی‌و نادروستیی ده‌قی چاپه‌که ،

دووه‌م : بۆ سوود وه‌رگرتن له‌و په‌راوێزو ڕوون کردنه‌وانه‌ی که بیستبووم که به‌سه‌ر زۆر له ده‌ستنووسه‌کانه‌وه هه‌ن • .

تا ماوه‌یه‌ك له پرس‌و ڕادا بووم بزانم کێ ئه‌م جۆره ده‌ستنووسه‌ی هه‌یه ، تا له دوای پرسیارێکی زۆر بۆم ده‌رکه‌وت مامۆستای پایه‌به‌رز شێخ (محمد)ی خاڵ نوسخه‌یه‌کی زۆر چاکی هه‌یه ، منیش به خێرایی چوومه خزمه‌تیی‌و ئه‌ویش نوسخه‌که‌ی خۆی دامێ که شایانی ڕێزو سوپاسێکی زۆره •

که سه‌یری ده‌ستنووسه‌که‌م کردو هه‌ندێکم له‌گه‌ڵ چاپه‌که‌دا به‌راورد کرد ـ که ئه‌ویش له سێ ده‌ستنووس وه‌رگیراوه ، متمانه‌پێ کراوه که‌یان له‌نووسینی‌ی مه‌لاڕه‌سوڵی تووداری‌ی نه‌قیبه‌ندییه که له ساڵی (١٣٠٧ك) نووسراوه‌ته‌وه ـ زۆر پێی دڵخۆش بووم ـ:

یه‌که‌م : له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به خه‌تێکی جوان نووسرابووه‌وه هێشتا پاك‌و خاوێن بوو ، به ئاسانیی ئه‌خوێنرایه‌وه •

دووه‌م : له‌به‌ر ئه‌وه له ساڵی (١٣٠٣) کۆچیدا به ده‌ستی شێخ (معروف)ی سیاگوێزی‌ی له پێنجوێندا نووسراوه‌ته‌وه‌و وادیاره له‌و کاته‌دا قوتابی‌ی بووه لای زانای گه‌وره مه‌لا (عبدالرحمان)ی پێنجوێنی‌ی‌و خۆیشی خوێنده‌وارێکی پایه‌به‌رز بووه ، جگه له‌وه‌ش به‌رواری نووسینه‌وه‌که‌ی له به‌رواری نوسخه ده‌ستنووسه‌که‌ی که متمانه‌ی

چاپەکەی لەسەربووە کۆن ترە •

سێهەم : لـە زۆر شوێندا پەراوێزی مەولەوی‌ی خۆی بە سەر وەیە کە کۆتایی بە (منه) دێ ، واتە لـە دانەری کتێبەکەوەیە ، ئەم پەراوێزانە کە هەندێکیانی بە عەرەبی‌ی‌و ئەوانی‌تری‌ی بە فارسی‌ی نووسیوە بایەخێکی زۆریان بۆ ڕاست کردنەوەی گەلێ دەقو ، ڕێبردن بە گەلێ جوانکاری هەیە ، جگە لـە زۆر واتای وردو ، وتەی بەنرخ سەبارەت بە زانیارییەکە خــۆی •

وە هەروەها قەیدو تەزبیب[1] ( القيد والتضبيب )ێکی ڕێك‌وپێکی بۆ کراوە کـە یارمەتی‌ی دروسـت‌خوێندنەوەو تێـگەیشـتنی زۆر لـە دەقەکان ئـەدات •

وازم لـە بەراوردەکە نەهێنا تـا دوابەیتی کتێبەکە ، بـە ڕاسـتی‌ی لـەم کارەدا بەهۆی دەسخەتەکەوە هەندێ هەڵـەی چاپەکەو بـە هـۆی چاپەکەیشـەوە هەندێ هەڵەی دەسـخەتەکـەم بۆ ڕاسـت‌کـرایەوە کـە زۆربەیان لـە ڕێی ڕێنووسەوە دروست‌بوون ، هەر وەکو لـە ئـەنجامی حەشاردانی هەموو باسەکانی کتێبەکەدا نەخشەی ئـەم کارەم لـە مێشـکدا بۆ دیاری‌بووو پشت بـە خودا دەستم دایــە •

---

(١) قەیدو تەزبیب ( القيد و التضبيب ) چەند نیشانەیەکی تایبەتە کۆن بۆ ڕوون کردنەوەی دەقی کتێبەکان لە جیاتی‌ی ئەونیشانانەی کە ئێستە پێیان ئەڵێن : ( علامات التنقيط ) Punctuation marks لەگەڵ هەندێ جیاوازیدا بەکار هێنراون •

# زانیاریی کەلام ( علم الکلام )

چونکە کتێبی ( العقیدة المرضیة ) بە شێوەیەکی سەرەکیی لە زانیاریی کەلام ئەدوێ ، پێویست بە لێدوانێکی کورت لەم زانیارییە ئەکات .

پێناسەی کەلام بە شێوەیەکی سادە : زانیارییێکە لە بیرو باوەڕە بنەڕەتییەکانی ئاینی ئیسلام ئەدوێ ، جگە لەم ناوە زانیاریی تەوحیدو ئوصوولی دینیشی بێ ئەڵێن (علم التوحید ، واصول الدین) واتە : زانیاریی خودا بەیەک گرتنو بنەڕەتەکانی ئاین .

گومان لەودا نیە لە ڕووی ئاینییەوە ئەم زانیارییە بایەخێکی زۆری هەیەو گەلێ بەنرخو ڕێزە ؛ چونکە هەر وکو باسمانکرد ، چارەسەری بیرو باوەڕە بنەڕەتییەکانی ئاینی ئیسلام ئەکات ، کە لەچاو مەبەستەکانی تردا وەکو بنکە وانو هیچیان بە بێ ئەم ڕاناوەستن .

ئەمزانیارییە باسی خوداو سیفەتو کردارەکانی ئەکاتو ، هەموو مەسەلەکانی ئەبێ بگەڕێنەوە سەر یەکێ لەمانە هەرچەند دووهەمو سێهەمیش هەر دەچنەوە سەر یەکەم ؛ بۆ وێنە باسی پێغەمبەر لەم ڕووەوە دەکرێ کە خودا ناردوویەتی ؛ واتە : باسی کردارێکی خودایەو ئەویش دەگەڕێتەوە سەر باسی خودا ، وە هەروەها باسەکانی تریش ئەبێ هەمان شێوە ببرێنەوە سەر خودا .

سەرەڕای ئەمەیش ، ئەبێ ئەو باس کراوە سەرەکیی و بنەڕەتیی بێ ،

لەبەر ئەمە زانا کەلامییەکان باسی پێشەوایی‌و جێگری‌ی : ( الأمامة والخلافة ) ، کە ڕووبەرێکی فراوانی بۆ خۆی داگیر کردووە لەم زانیارییەدا ، بە ددزەکی‌ی دائەنێن‌و ئەڵێن شوێنی خۆی زانیاری‌ی فیقهە ، کە چارەسەری لق‌وپۆپەکانی ئاینی ئیسلام دەکات .

مەبەستی سەرەکی‌ی ئەم زانیارییە پاریزکاری‌ی بیرو باوەڕە بنەڕەتییەکانی ئاینی ئیسلامە لە سەرەنیزەی کفرو تیری کومڕایی‌ی‌و بەرگری‌ی‌و جەنگانە لە دەڵە بیرو باوەڕی هیچ‌و پووچداو هەوڵدانە بۆ تێگەیشتنی بیرو باوەڕی ئیسلامی‌ی بە شێوەیەکی ڕاست‌و دوور لە خێچ‌و خواری‌ی‌و خاوێن لە تەپ‌و تۆزی ڕای کۆمەڵە گومڕاکان ..

ئەم زانیارییە لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی سادە بووەو قووڵ دانەچووە لە بەراوردو ڕافەو بەڵگەدا ؛ چونکە ئەو گومان‌و دوو دڵییانەی کە ئەی‌ویست چارەسەریان کا ، پێویستیان بە لەوە زیاتر نەئەکرد . بەڵام دوای وەرگێڕانی فەلسەفەی گریکی‌ی گەلێ تەنگ‌و چەڵەمەی نوێ هاتنەکایەوە ، کە پێویستیان بە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵتر ئەکرد ، تێیەدا لە سەرەتاوە موعتەزیلە : ( المعتزلة )(۱) سووڕێکی بالأیان گێڕا ؛ چونکە

---

بۆ سەردەمی پێشەوای گەورە حەسەنی بەسرەیی ، کە ڕۆژێ پرسیارێك هاتە حزمەتی‌ی‌و گوتی :ـ لەم سەردەمەدا کۆمەڵێ پەیدابوون ئەڵێن : خاوەن گوناهی گەورە کافرەو کۆمەڵێکی کەش ئەڵێن : لەگەڵ باوەڕدا هیچ گوناهێ زیانی نییە . پێشەوا ماوەیەك بیری لێ‌کردەوەو پێش ئەوەی سەر هەڵبڕێ بۆ وەڵامدانەوە واسیلی کوڕی عەتا ( واصل بن عطاء ) کە قوتابی‌ی حەسەن‌بوو گوتی : من خاوەن گوناهی گەورە نە بەباوەڕدار نە بەکافر دانانێم ، بەڵکوو لە هەوارگەیەکە لەناو هەر دوو هەوارگەکەدا : ( منزلة بين المنزلتين ) ، لەپاشا هەستاو چووە لای کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی

بڕوایەکی بەهێزو پتەویان هەبوو بە توانای عەقڵو ڕێدەرکردنی لە زۆر تەنگ‌و چەڵەمەدا .

ئەم ڕێبازە هەرچەند زۆر کارەساتی دڵتەزێن‌و بەسۆو داخی بەرپا کرد ، بۆ زانیاری‌ی کەلام بوو بە خێرو پەرەی پێ سەندو چەندان بەڵگەی نوێ‌و بیری وردو لێکۆڵینەوەی بەهێز هاتە کایەوە .

لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنەدا ، ئیعتیزال خۆیشی لەناو زانایان‌و بیرتیژان‌و کاربەدەستاندا ، ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی ئەسەندو برەوی پەیدا ئەکردو پەیڕەوو دواکەوتوانی پتر ئەبوون تا ڕۆژێ شێخ (ابوالحسن)ی ئەشعەری‌ی[(٢)] کە لە کوڕی ئەبووعەلی‌ی جوبائی‌ی : ( ابو علي

---

مزگەوتەکەو دەستی‌کرد بە ڕوون کردنەوەی وەڵامەکەی بۆ هاوەڵەکانی ، حەسەنیش فەرمووی : ( قد اعتزل عنا ) ، واتە : وا لای لێ گرتیین ، لەمەوە خۆی‌و هاوڵەکانی ناونران بە متوعتەزیلە ( المعتزلة ) : لاگرەکان بەڵام ، خۆیان بە ( اصحاب العدل والتوحيد ) : کۆمەڵی دادو خودابەیەک‌گرتن ناو ئەنێن ، مەبەستیان ئەوەیە مرۆڤ بە زۆرلێ‌کراو دانانێن‌و سیفاتییش بە شتێکی جیاواز لەخودا ناژمێرن .

لە سەرەتاوە ئەم کۆمەڵەش بە شێوەیەکی سادە چارەسەری تەنگ‌و چەڵەمەکانیان ئەکرد ، بەڵام دوای وەرگێرانی فەلسەفەی یۆنانی‌ی بەمەبەستی بەدەست هێنانی بەڵگەی نوێ دەستیان دایە پشکنینی کتێبەکانی فەلسەفەو وەکو باسمان‌کرد لە ئەنجامدا زانیاری‌ی کەلام پەرەی پێ‌سەند .

(٢) شێخ ( ابو الحسن )ی ئەشعەری‌ی : (٢٦٠ ـ ٣٢٤ك / ٨٧٤ ـ ٩٣٦ز) ( علی )ی کوڕی ( اسماعيل ) لە بەسرە لە دایک‌بووەو لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە کتێبی زۆری داناوە بۆبەرگری‌ی لە بیرو باوەڕی سوننەت‌و جەماعەت ، بەناوبانگتریان ئەمانەن ( اللمع

الجبائي )[٣]دا وەك قوتابییەك خەریکی فێربوونی بیرو ڕای ئیعتزالبوو گەیشتە مەسەلەی پێویستیی چاکترین بۆ بەندە لەسەر خودا : (وجوب الأصلح للعبد على الله ) ، ئەشعەریی ئەم پرسیارەی بە بیردا هات ٠

ڕات چییە لە سێ برادا ، یەکەمیان بە منداڵیی دەمرێو دووەم بە پێگەیوییو خودا پەرستیی سێهەمیش بە پێگەیوییو یاخیی بوونەوە ؟ ئەبوو عەلیی وەڵامی دایەوە : سێهەم لە ئاگردایەو دووەم لەبەهەشتاو یەکەمیش نە سزا ئەدرێو نە پاداش ئەدرێتەوە ٠ ئەشعەریی فەرمووی : ئەگەر یەکەم وتی : بۆ نەت هێشت گەورە بمو بتپەرستمو بچمە بەهەشت وەك برای دووەمم ؟ خودا چ وەڵامێکی ئەداتەوە ؟ ئەبووعەلیی وتی : خودا پێی ئەفەرموێ : ئەمزانیی ، ئەگەر گەورە بووتایە یاخیی دەر ئەچوویتو لە ئاگردا ئەبوویت وەك برای سێهەمت، ئەمە چاکترە بۆت ٠

ئەشعەریی فەرمووی : ئەگەر سێهەم ڕاست بووەوە، وتی: خودایە: ئەی بۆچی منیشت وەك برا بچکۆلەکەم بە منداڵیی نەکوشت تا تووشی ئەم سزا سەختە نەبوومایە ؟ خودا چیپێئەڵێ ؟

لێرەدا ئەبووعەلیی ڕۆچوو لە دەریای بیرو سەرسامییداو هیچ وەڵامێکی بۆ نەدرایەوە ، شێخی ئەشعەریش کۆڕەکەی بەجێهێشتو لە

---

في الرد على أهل الزيغ والبدع ) ، ( مقالات الاسلاميين ) ، ( الابانة عن أصول الديانة ) ٠

(٣) **ئەبوو عەلیی جوببائیی ( ابو علي الجبائي )** : ( محمد )ی کوڕی ( عبدالوهاب ) ، یەکێکە لە پێشەواکانی موعتەزیلە لە ( جوبا )ی خووزستان لە دایکبووەو لەبەسرەدا ناوبانگی دەر کردووەو هەر لەوێشدا لە بەرواری (٣٠٣ك/٩١٥ز) کۆچی دوایی کردووە ٠

نزیكترین دەرفەتدا ، ڕۆژی هەینیی لە مزگەوتی گەورەی بەسرە چووە سەر كورسییەكەو پڕ بە دەمی خۆی هاواری كرد : ئەوەی ناسیومیی لەمەوپێش زانیویەتی چ بیرو باوەڕێكم بووە ، ئەوەیشی ئەی ناسیوم وا خۆمیی پێ ئەناسێنم : من فلانی كوڕی فلانم لەمەوپێش ئەم ئوت : قورئان ئەزەلیی نییەو خودا لە كاتی پێویستدا ـ وەك ڕووداوەكانی تر ـ دروستی كردووە ، وە خودا بەچاو نابینرێت ، وە كاری خۆمان خۆمان ئەی كەین و خوداهیچ دەخلێكی بەسەرەوە نیە • وا من لە هەموو ئەمانە پاشگەز بوومەوەو تۆ بەم كرد ، وە لەمەوووا خۆم ئامادە ئەكەم بۆ هەڵوەشاندنەوەی بیرو باوەڕی موعتەزیلەكان و دەرخستنی عەیب و شووردییان •

ئا بەم جۆرە شێخ ( ابو الحسن )ی ئەشعەریی بڕیاریدا كە نەك هەر لە مەسەلەی پرسیارەكەدا بەڵكو لە هەموو مەسەلەكانی تریشدا بگەڕێتەوە سەربیرو باوەڕی چینی پێشووی موسوڵمانان كە لە كتێبی خوداو فەرمووودەی پێغەمەرو ڕەوشتی یارانیەوە وەرگیراوە ، بەلام نەك لەسەر ڕێو شوێنی ئەهلی حەدیث[٤] ، چونكە تەنگ‌وچەڵەمەی بیری

---

(٤) ئەهلی حەدیث : ڕێبازی ئەم كۆمەڵە باوەڕ كردنە بەوەی لە قورئان و حەدیثدا هاتووە بێ چەن‌وچوون و لێكۆڵینەوەو پاساودان ، لە ئیمامی مالیكیان پرسیی لە ئایەتی : ( الرحمن على العرش استوى )دا چی ئەڵێی ، ئەویش فەرمووی : ئیستیوا ڕاستەو چۆنێتییەكەی نازانرێ‌و بڕوا پێی پێویستەو پرسیاریش لێی بیدعەتەو لە ئیسلامدا نەبووە • ئەشعەرییش هەمان باوەڕی بووە ، بەڵام هەروەكو خۆی لە : ( الابانة عن أصول الديانة )دا فەرموویەتی لەبەر پێویستیی سەردەم پەلاماری بەڵگەو پاساوی داوە •
جگە لە ئەشعەرییەكان كۆمەڵێكی تریش هەبوون لە ڕۆژهەڵاتدا

سەردەم پێویستی بە هەمان لێکۆڵینەوەو بیری قووڵی موعتەزیلە هەیەو ئەبێ لەسەر بنەڕەتێکی قایمو بەهێز ، بەسوود وەرگرتن لە سەرجەمی بیرو باوەڕی هاوچەرخ ، بیرو باوەڕی سوننەتو کۆمەڵ بسەلمێنرێ • تا بەم جۆرە کۆمەکێکی نوێ لەڕێبازو ، کۆنلەبڕوادا دروست بوونو ناونران : ئەهلی سوننەتو جەماعەت : ( اهل السنة والجماعة ) وە یا ئەشعەرییەکان ( الأشاعرة ، الأشعريّة ) ، کە لە زۆربەی بیرو ڕایاندا لە

---

لەسەر هەمان ڕێباز ڕۆییشتوون بەلاّم کەمتر لە بەڵگەو بەراوردا ڕۆچوون ، پێیان ئەڵێن : ماتوریدییەکان ( الماتريدية ) بە ناوی پێشەوا ئەبومەنسوری ماتورییدییەوە ، مەولەوی ئەڵێ :

( لە ئەصلیدیینا دووکەسن مەشهوور
شێخی ئەشعەریی شێخ ئەبوو مەنصوور )

لە هەندێ مەسەلەدا جیاوازییان لەگەڵ ئەشعەرییەکاندا ، هەیە وەکوو مەسەلەی ئیرادەی جوزئیی کە لە شوێنی خۆیدا ڕای مەولەوییمان لەم ڕووەوە هێناوە • لە باسی سیفەتەکانی خودایشدا ڕایەکی شێخ ئەبوو مەنسوورو ڕایەکی شێخی ئەشعەریی خۆی ، یەك ئەخاو هەردووکیان بە جووتە ڕەت ئەکاتەوەو ئەڵێ :

( ئەشعەریی فەرمووی بەقا هەشتەمیین
شێخ ئەبوومەنصوور دەفەرموێت تەکوین )

( تەکوین لە لای ئەم بەقا لە لای ئەو
وەصفی وجوودیین ئەمما تۆ مەشنەو )

( حەق واتە بەقا لە سەلبییاتە
تەکوین لە جوملەی ئیضافییاتە )

لێرەدا مەولەوی ڕای جەماوەری ئەهلی سوننەت پەسەند ئەکا کە کە ئەڵێن : سیفاتی وجوودیی خودا هەر ئەم حەوتەن : ( ویستو تواناو ژیانو زانینو ، بیستنو بینینو گوتن : الارادة والقدرة والحياة والعلم والسمع والبصر والكلام ) •

ڕێو شوێنی ئەشعەریەوە ئەڕۆیشتن •

ئەم کۆمەڵە گەلێ زانـای پایەبەرزو پێشـەوای گـەورەیان تێـدا هەڵکەوت وەك: قازیی ئەبووبەکری باقیلانیی‌و[٥] ئوستاد (ابو اسحاق)ی ئەسفەرایینیی‌و[٦] ( امام الحرمین )[٧] ، کە زانیاریی کەلام بە هۆی ئەمانەوە بە جۆرێ پەرەی سەند کە نـەك تەنها بۆ بەرگریی‌و دەمکوت ، دژی ناحەز بە ئایین دەست بداتو بەس ، بەڵکو بۆ ڕەواندنەوەی تەمی

(٥) قازیی ئەبووبەکری باقیلانیی : ( محمد )ی کوڕی ( طیب ) ، زانایەکی هەڵکەوتوو بووەو بەناوبانگ بووە بە کەلام زانیین ، نێرراوە بۆ قوستەنتینییە ( ئەستەمبوول ) بۆ بۆڕدانی قەشـە مەسیحییـەکانو وەکـو ئەگێڕنەوە زۆر سەرکـەوتوو بووە لـە کارەکەیدا ، خاوەنی گەلێ کتێبە ، یەکێکیان ( التمهيد )ە لە کەلامدا کە لەگەڵ توێژانەوەدا لە چاپ دراوە ، لە بەسرە لە دایك بووەو لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە لەبەرواری (٣٣٨ ـ ٤٠٣ك / ٩٥٠ ـ ١٠١٣ز) •

(٦) ئوستاد ( ابو اسحاق )ی ئەسفەرایینیی : ( ابراهیم )ی کوڕی ( محمـد )ی کوڕی ( ابراهیم )ی کوڕی ( مهران ) ، یەکێ لـە پێشـەواکانی ئوصوولی فیقهـ و کەلامە ، خاوەنی کتێبی ( الجامع في أصول الدين والرد على الملحدين )ە لە (٤١٨ك / ١٠٢٧ز)دا کۆچی دوایی کردووە •

(٧) ( امام الحرمین ) : ( عبدالملك )ی کوڕی ( عبدالله )ی جوەینی ، لە نیسابوور پەروەردو بووەو کۆچی کردووە بۆحیجازو دەسـتی کردووە بەوانە وتنەوە فتوادان لە ( مكه )و ( مدينه )دا لەبەر ئەوە شـۆرەتی ڕۆیشت بە ( امـام الحـرمين ) لە پاشا گەڕایەوە بـۆ نیسابوورو ( نظام‌الملك ) قوتابخانەی ( نظاميه )ی بۆ دروستکرد ، خاوەنی گەلێ کتێبی گرنگە ، یەکێکیان ( ارشاد )ە لە زانیاریی کـەلامدا ، لـە بـەرواری (٤٧٨ك / ١٠٨٥ز) دا کـۆچی دوایی کردووە •

گومانو بەرهەڵستیی شەپۆلی دوو دڵیش هەر بە سوود بێ ٠

ئیمامی غەزالی[٨] لـە سنووری ئەوانیش تێپەڕیو پاش دانانی چەند کتێب لـە زانیاریی کەلامدا ، کە مەبەستی سەرەکیان بەرگری بوو لـە بیرو باوەڕی ئەشعەرییەکان ، دەستیدایە شێوازێکی فراوانتر بۆ بەرگری کردن لـە ئاینی ئیسلام بـە شێوەیەکی گشتیی ؛ چونکـە گەلێ بیرو باوەڕی فەلسەفەی گریکیی کە زۆریـان لـە بنـەڕەتێـکی بتپەرستییەوە هاتبوون زاڵ بووبوون بەسەر مێشکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەداو گەلێ بەڕاستو بێخەوش ئەهاتە بەر چاویان ، لـەبـەر ئـەوە هات مەردانە دەستی دایە خوێنـدنەوەی فەلسـەفەی گریکیی بـە تایبەت فەلسەفەی : ئەفلاتوونو[٩] ئەرەسـتۆ[١٠] بە پێی بۆچـوونـی

---

(٨) ئیمامی غەزالی : ( محمد )ی کوڕی ( محمد ) ، لە غەزالەی تووس هاتووەتە دنیاوە لای ( امام الحرمین ) خوێندوویەتی ، ماوە یەك وانەی لە قوتابخانەی ( نظامیه )ی بەغدادا وتووەتەوە ، ژیانی خۆی بەختکردووە بە گەڕان بە دوای ڕاستیداو هەموو جۆرە بیرو باوەڕێکی بە ئەوپەڕی سەربەستیی ئازادییەوە تاقیی کردووەتەوە، بەناوبانگترین کتێبی : ( احیاء علوم الدین )و ( تهافت الفلاسفة )یە لە بەرواری (٥٠٥ك / ١١١١ز)دا کۆچی دوایی کردووەو تەمەنی (٥٥) ساڵی مانگیی بووە ٠

(٩) ئـەفلاتوون : PLATON (٤٢٧ ـ ٣٤٧ ب٠ز) ، بە ناوبانگترین فـەیلەسووفی گریکییـە ، قوتابی سۆکـراتو مامۆسـتای ئەرەستۆ بووە ، بە ناوبانگترین کتێبی ( کۆرمار )ە ٠

(١٠) ئەرەستۆ : فەیلەسووفێکی گریکیی گەورەیە ، مۆستای ئەسکەندەر بووە ، توانی زانیاریی مەنتیق (Logic) لە هەشت کتێبدا بە شێوەیەکی تەواو ڕوونکاتەوە ، لە (٣٨٤ ـ ٣٢٢ب٠ز)دا ژیاوە ٠

فاڕابی‌ی‌و[11] (ابن سینا)و[12] پاش بەراوردو تەتەڵەیەکی دووساڵی‌ی وەکو خۆی لـە ( المنقذ من الضلال )دا ئەفەرموێ : لـە مەرزی بڕ کردنی هێزی مێشکی ئەمانیش تێپەڕی‌و توانی‌ی کتێبی : ( تهافت الفلاسفه ) دابنێ کە لە (٢٠)بیست مەسەلەی سەرەکیدا ڕای فەلسەفەی هەڵوەشاندووەو ئەو متمانەو دڵنیاییەی کە لەدڵی خەڵکا هەیبوو هەڵکەندو ئیتر بەو ڕێزەی جارانەوە سەیر نەئەکراو ، وەك سەرەتایەك دان بەوەدا نرا کە فەلسەفەش هەڵەی تێدایەو ڕەخنەو گۆڕان ڕووی تێدەکەن ٠

لە ئەنجامدا ئیمامی غەزالی‌ی شۆرەت‌و ناوبانگێکی یەکجار فراوانی پەیداکردو بیرو ڕای هاوچەرخی گێژدا لە تەوورەی بیرو ڕای قووڵ‌و بەتینی خۆیداو ئیتر لەو سەردەمەوە وردە وردە باسەکانی فەلسەفە هەر ئەهاتنە ناو زانیاری‌ی کەلامەوە تا کەلامی دواکەوتووەکان : ( المتأخرین ) لـە سەرناوو هەندێ ناوەرۆکدا لەگەڵ فەلسەفە خۆیدا جیا نە ئەکرانەوە مەگـەر بـە مەسـەلە بیستراوییەکاندا نـەبێ : ( مسـائل السمعیات )و کاربەمەوە نەوەستا تا مەنتیقیش بوو بە سەرەتای زۆر لە کتێبە کەلامەکان٠ دوای غەزالی‌ی چەند زانایـەکی پایەبـەرزی‌تر هاتنـە مـەیدانەوە وەك :

---

(١١) فاڕابی‌ی : ( محمد ) کوڕی ( تەرخان ) ، لە فاڕاب ( تورکستان ) چاوی هەڵهێناوە ، لە دیمشق لە بەروارى (٩٥٠ز) کۆچی دوایی‌ی کردووە ناوبانگی بـە فەلسەفەو مۆسیقاوە دەرکردووە ، گـەلێ کتێبی سەربەخۆو لێکدانەوەی کتێبەکانی ئەرەستۆی هەیە ٠

(١٢) ( ابن سینا ) : ( حسین )ی کوڕی ( عبدالله ) ، لە ئەخشەنە لـە نزیك بوخارا لە دایك‌بووەو لە هەمەدان کۆچی‌دوایی کردووە لە سالی (٩٨٠ ـ ١٠٣٧ز)دا ٠ ناوبانگی بـە ( الشیخ الرئیس ) دەرکـردووە ، گرنگترین کتێبەکانی : ( الشفاء ) ، ( الاشارات والتنبیهات ) لە مەنتیق‌و فەلسەفەداو ( القانون ) لە پزیشکییدا ٠

شـەهرستـانی‌ی‌و[۱۳] ئـامێـدی‌ی‌و[۱٤] ئیمـامـی ڕازی‌ی‌و[۱۵] بـەیزاوی‌ی‌و[۱٦] قـازی‌ی عـەزودو[۱۷] تەفتـازانی‌ی‌و[۱۸] وسەیید

---

(۱۳) شەهرستانی‌ی ( الشهرستانی ) : ( محمد )ی کوڕی ( عبدالکریم ) لـە شەهرستان : ( خۆراسان ) لە دایك‌بووە ، مێژوونووسێکی گـەورەی بیرو باوەڕە ، خـاوەنی کتێبی : ( الملل والنحـل )و ( نهایة الاقدام )ە لە ساڵی : (۱۰۷۹) تا (۱۱۵۳)ی زایینـدا ژیاوە ۰

(۱٤) ئامێدی‌ی : ( الآمدی ) ( سیف‌الدین ، علی )ی کوڕی ( محمد )ی کوڕی ( سالم ) ، لە ئامێدی‌ی ( عمادیة ) لە دایك‌بووە لە دیمشق لە ساڵی (٦٤١ك / ۱۲۳۳ز) کۆچی دوایی‌ی کردووە زانایـەکی متمانە پێ‌کراوەو گەلێ ڕای بەهێزی هـەیە ، بـە ناوبانگ‌ترین کتێبی ( الاحکام في اصول الاحکام ) و ( أبکار الافکار )ە ، لـە کەلامدا ۰

(۱۵) ئیمامی ڕازی‌ی : ( محمـد )ی کوڕی ( عمر )ی بەناوبانگ بـە ( فخرالدین ) لە ڕەی چاوی هەڵهێناوەو لە هەرات لە (٦۰٦ك / ۱۱۵۳ز)دا کۆچی دوایی‌ی کردووە ، زانیارییەکی زۆر فراوانی بووە ، خاوەنی گەلێ کتێبە بە ناوبانگتریان تەفسییری ( مفاتیح الغیب )ە ۰

(۱٦) بەیزاوی‌ی : ( عبدالله )ی کوڕی ( عمر )ی بەناوبانگ بە قازی‌ی ( ناصرالدین ) ، لە بەیزا : ( شیراز ) لە دایك‌بووەو لە (٦۸۵ك / ۱۲۸۵ز)دا کۆچی دوایی‌ی کردووە ۰

(۱۷) قازی‌ی عـەزود : ( القاضی عضدالدین الایجی ) ، لـە ئیبیج لـە دایك‌بووە ،، لە زیندانا لە ساڵی (۷۵٦ك / ۱۳۵۵ز) کۆچی دوایی‌ی کردووە لە کلامدا کتێبی ( المواقف )ی هـەیە ، کـە گرنگترین کتێبی ئەم زانیارییەیە ۰

(۱۸) تەفتازانی‌ی : ( مسعود )ی کـوڕی ( عمـر )ی بەناوبانگ بـە ( سعدالدین ) ، زانایەکی بەدەست بووە لـە گـەلێ زانیارییدا خاوەنی ( المقاصد )و ( شرح المقاصد )و ( شرح العقـائد )ە لـە زانیاری‌ی کەلامدا لە ناوەند ئەم ساڵانەدا ژیاوە (۷۱۲ ـ ۷۹۱ك / ۱۳۱۲ ـ ۱۳۸۹ز) ۰

شەریفی جورجانیی[19] ، کـە هەر یەکەیان نموێن دەسـتی ئاشـکرای خۆی هەیە لەم زانیارییەدا • وە هەر وەها گەلێ کتێبی وەك (ابكار الأفكار)ی ئامێدیی‌و ( مواقف ) و ( مقاصد )و ( طوالع )و شەرح‌و پەراوێزەکانیـان دانران‌و زانیاریی کەلام گەیشتە هەرە لووتکەی بەرزی خۆی •

لە دوا نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی کۆچیی ئەم زانیاریـە لـە پێشڕەویی کەوت‌و چووە دۆخی ڕاوەستان‌و بەستنەوەو جگە لە پەراوێز لێنان کورت کردنەوەو جێ‌گۆڕکێ نەبێ ، هیـچ هەوڵ‌و تەقالایەکی نوێ کردنەوە نەما ؟ چونکە سنووری مەسەلەکان ڕەنگ ڕێژرابوون‌و هێڵەکانی بەتەواویی دەرکەوتبوون ، تەنانەت لـە هەندێ شوێنیشدا دەستنیشـانی ئەوەش کرابوو تـا کوێ عەقڵ بڕ دەکات‌و لـە کوێشدا پەکی ئەکەوێ ؟

مەولەوییش بەسەر ئەم زانستە تەواوەدا هات‌و بەئاسانیی توانیی خۆی لـە خوانی ڕازاوەی تێر کاو بەهرەیەکی باشی تێدا بەدەس بێنێ • وە لەبەر ئەوە بەهرەیەکی یەکجار سەرکەوتووی شـیعرینـی هـەبوو ، ویستی سوودی لێوەر گرێ بۆ خزمەت کردنی زانیاریی کەلام‌و هات سەر لـە نوێ دای ڕشتەوە بەو زمانانەی کە ئەیزانیین ، بەم جۆرە سێ کتێب‌و هۆنراوەی بـە نرخی بێوێنـە ، چاویان هەڵهێناو باخچـەی زانیـاریی کەلامیان ڕازاندەوەو بۆن‌و بەرامەی خۆشیان بە سەر کەلام دۆستەکاندا بڵاوکردەوە • یەکەم‌و دووەم : (العقيدة المرضية)یە بە کوردیی‌و (فوائح)ە

---

(١٩) سەییدی شەریفی جورجانی : ( علی ) کوڕی ( محمد )ی بەناوبانگ بە ( السيد الشريف ) زانیارییەکی فراوانی بووە ، بەناوبانگ‌ترین کتێبی : ( شرح المواقف )ە لە زانیاریی کەلامدا ، لە شیرازەوە تەیمووری لەنگ بردیی بۆ سەمەرقەند لـە ناوەند ئەم ساڵانەدا ژیاوە (١٣٣٩ ــ ١٤١٣ز) •

بـه فارسیی که خوالێخۆش‌بوو ( محي‌الدين صبري النعيمي ) لـه میـژ ده چاپی دان لـه ساڵی : ( ١٣٥٢ك/١٩٣٤ز )دا بەرێنووسی فارسیی و ئازادەیەکی زۆر چاپەکە بێ‌هەڵەیە •

سێهەم : هۆنراوەی ( الفضيلة )یە بە عەرەبیی کە مامۆستا مـەلا ( عبدالكريم )ی مودەڕڕیس ، لەگەڵ شەرحێکی درێـژەداری خۆیدا بـە ناوی ( الوسيلة في شرح الفضيلة ) لـە چاپی دان لە سـاڵی : ( ١٣٩٢ك/١٩٧٢ز )دا •

مەولەویی نزیکـەی : (٨٠٠) بـەیتی لـە ( العقيـدة المرضية ) هەڵبژاردووەو ناوی ناوە : عەقیدەی کوردیی کە هێشتا نە چاپ نەدراوە، وە هـەر وەهـا عەقیدەیەکی بچوکیشی داناوە بۆ منداڵ کـە مامۆستا محەمەد عەلیی قەرەداغیی لـە ساڵی . (١٣٩٧ك/١٩٧٧ز)دا لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد لـە بەغدا لە چاپیدا •

# پێرستی کتێبی : ( العقیدة المرضیة )

مەولەوی پێرستی کتێبەکەی لە سەر بنچینەیەکی ڕوونو گەلێ ناسكو دڵگیر داناوە : هاتووە فەرمووودەی باوەڕ : ( الأیمان ان تؤمن بالله وملائکته وکتبه ورسله وبالیوم الاخر وبالقدر خیره وشره من الله تعالی )ی کردووە بە بنەڕەتو هۆنراوەکەی کردووە بەڕاڤەو لێکۆڵینەوەی فەرموودەکە لە هەر شوێنێکا بە پێی دەرەتانی خۆیو تا سنووری گونجان باسەکەی فراوان کردووە •

لەبەر ئەمە هۆنراوەکەی کردووە بە شەش بەشی سەرەکییەوە جگە لە سەرەتا ، کە چارەسەری شتە گشتییەکان : ( الأمور العامة )ی تێدا دەکات وەك : تێبینیو بوونو شیاویی : ( النظر والوجود والامكان ) وە یا باسی ئەو شتانەی تیادا دەکا کەپەیوەندیی بە کتێبەکە خۆیەوە هەیە • بە هەر یەکێ لەم بەشانە ئەڵێ: ئەسل (الأصل): بنەڕەت، تەنها لە شەشەمدا نەبێ ئەم وشەیە بەکار ناهێنێو ناوی هەوارگە دێنێتە کایەوە :

**وەسەر هەوارگەی شەشە مییندا**
**قەضاوو قەدەر وان ، لە کەمییندا**

بەڵێ هەوارگەیەو ڕێبوار کە گەیشتە ئەوێ پێویستی بەبار خستنو حەواندنەوە هەیە ، هەر چەند وابزانم هەوارگەیەکی سەختەو پێویستی بە هەڵسو کەوتێکی زۆر هەیە بۆ دارو بەرد لابردنو جێ خۆش کردنو لەوانەشە تووشیی بەردەڵانو تووڵە ڕێی بێ ، کە بەربێتەوەو ملی بشکێ یا ڕێی لێ تێك چێو سەر نەهێنێتە دواوە ؟ چونکە بەڕاستی مەولەوی خۆی گەلێ تێدا هیلاك کردووەو گرنگییو بایەخێکی زۆریی داوەتێ، بە جۆرێ بیرو ڕا نەماوە تەتەڵەی نەکاو هیچ کونو قوژبنێکی نەهێشتووەتەوە سەری پیا نەکا •

لە نوسخە دەستنووسەکەدا هیچ جۆرە سەر ناوێك بە بەخشـان بەدیی ناکرێ تەنها ئەو بەیتەی سەرەتای یەکێ لە شەش بەشەکانە ، هەردوو مەسرەعەکەی لـە ناوەڕاستداو لەژێریەکدا نووسراونەتەوە ، مەسرەعی بەیتەکانی تر بەرانبەرن • من وای بۆ ئەچم ئەمە شێوەی نووسینەوەی مەولەویی خۆی بێو ئەو سەرناوانەی لە چاپەکەی میسردا بەدیی ئەکرێ بۆیان زیاد کـردبێ بە تایبەت ئەگەر یەکێ بـەوردی سەیریان بکابۆی دەرئەکەوێ هەندێکیان گونجاونیین لەگەڵ شوێنە کەیاندا •

# شێوزای دوانی ئەم کتێبە

هەر چەند وەکو باسمان کردکتێبی : (العقیدة المرضیة) لە زانیاریی کەلام ئەدوێ ، ئەمو زۆر جیاوازیشی لەگەڵ تێبو هۆنراوەکانی تری ئەم زانیارییەدا هەیە •

لە هەر شوێنێکدا هەلێکی دەست کەوێ باسی سۆفیکەریی و زنجیرەی ڕابەرەکانی دێنێتە کایەوەو ئەیکاتە ناواخی باسە کەلامیەکان ، کە ئەمە بەدیی ناکرێ لە کتێبو هۆنراوەکانی تری کەلامداو ئەگەر شتێکیش هەبێ بەو جۆرەی مەولەویی نیە •

خاڵێکی تر ئەوەیە گوێی لە پوختەکردنی دەربڕین نەبووەو هەر چۆنو لە هەر کوێ بۆی ڕێکەوتبێ ، ئاوزەنگی لە ئەسپی وتاریی داوەو چەپڵەی لە کۆتری ئەندێشەی کوتاوە ، با سەریشی کێشابێ بۆ درێژە دانو دووبات کردنەوە ، هەر چەند لە ڕووی شیعرییە وە ، بە هۆی جیاوازیی شێوەی دەربڕینو لەیەك نەچوونی وێنەکانیانەوە ، بە دووپات دانانرێن •

وە هەر وەها لە هەندێ مەسەلەدا وەك باسی میعراجو چوار یاری پێغەمەرو نەوەکانیو هەندێ مەسەلەی تریش بە شێوەیەکی پڕ لە سۆزو خەیاڵ دواوەو بە جۆری جوانکاریی تێدا بەکار هێناوەو وتاری لێ ڕازاندووەتەوەو درێژەی پێ داوە مەگەر هەر لە دەست مەولەویی خۆی هاتبێ •

ئەمەش تامو چەشتێکی وای داوەتە ئەم جۆرە پارچانەی کە سەدان بەڵکو هەزاران کەس هەر لە مێژەوە لەبەریان کردووەو بووە بە ویردی سەر زمانیانو لە کاتی خۆشیی و ناخۆشیی و لە وەختی تەنیاییی و کۆبوونەوە گشتییەکانو لە میحرابی وەعزو سەر مینبەرەکاندا خوێندوویانەتەوەو ، وتاری خۆیان پێ ئارایش داوە •

# هۆنراوەیە یا شیعر ؟

باسی پێشوو سەر بۆ ئەم پرسیارە ئەکێشێو وەڵامەکەیشی یەکێکە لەو مەبەستانەی ئەمانەوێ لەم لێکۆڵینەوەدا بیگەینێ ؛ بەڕاستیی لە هەندێ شوێندا لە داوی هۆنراوەی ڕووت دەرباز ئەبێو خۆی ئەگەیێنێتە لوتکەی هەرە بەرزی شیعر بە هەموو ئەندێشەو هێماو جوانکاریی‌و چەش‌و تامیەوە •

مەولەویی لە دەقی کتێبەکەو لە پەراوێزەکانیشا خۆی بە هۆنەر (ناظم)و کتێبەکەشی بە هۆنراوە (نظم) ناوبردووە ، سەربارەت بەوەی زۆربەی کتێبەکە شێوازی هۆنراوەی گرتووەتە بەر ، بە هوی سروشتی باسە فەلسەفیی‌و کەلامییەکانەوە، هەرچەند ڕەقەنیی‌و وشکیی ئەم باسانەی سەرجەم بۆ نەبووەتە کۆسپ‌و جاروبار شەونمی ئەندێشەو شێی خەیاڵی ئامادەیان کردوون بۆچوونە ناو چوار جێوەی شیعرێکی ناسك‌و دڵگیرەوە ، وەکو لە هەندێ لە هەڵبژاردەکانا دەر ئەکەوێ •

جگە لەمە نەریتیش وابووە ئەم جۆرە کتێبانە بە هۆنراوە دانێن هەرچەند مەرجی شیعریش لە هەندێ پارچەکانیاندا هەبێ •

# بنەڕەتی هەڵبژاردنی نموونەکان

باسەکەی پێشوو تیشکێکی تەواو ئەخاتە سەر ئەم مەسەلەو ڕێو شوێنی بۆ دیاریی دەکات •

دیارە ئەبێ ئەو نموونانەم هەڵبژاردبێ زۆرتر خەیاڵێکی شیعریی‌و ڕوویەکی ڕووناکی ڕەوانبێژییان هەبێ •

ڕاستە ئەمە وایە ، بەڵام وەنەبێ هەرچی ئەم جۆرە بێت هێنابێتم‌و هەرچییشم هێنابێ هەرشیعر بێ‌و هۆنراوەی تێدانەبێ ، چونکە هۆی تریشی تێدا ڕەچاو کراوە •

ئەو نموونانەی لەم لێکۆڵینەوەدا هێنراون نزیکەی دەیەکی سەرجەمی کتێبەکەیەو ، هەند بە ئەنقەست‌و هەند بە ڕێکەوت زۆربەی شیعر دەرچوون، وە ئەوەشی‌ی هۆنراوەی ڕووتە بوونی‌ی نەك تەنها زیانی نیە ، بەڵکو پێویستە بۆ تەواوێتیی‌ی لێکۆڵینەوەکەو پێشچاوخستنی وێنەیەکی نزیك لە ڕووداو (الواقع) لە بابەت کتێبەکەوە •

## ناوی : ( العقيدة المرضية ) له کویێوه هاتووه ؟

لـه هۆنراوه‌که خۆیدا هیچ‌باسێ لەم ڕووەوە نیه ، بەڵام لـه پەسەند (تقريظ) کـــردنێـکا ، کە مـەولـەوی‌ی خـۆی بەزمانــی عـەرەبی‌ی هۆندوویەتیەوە بنچ‌و بنەوانی ئەم ناونانە بە تەواوی‌ی ڕوون ئەکاتـەوەو نیشکێکی دەرخەری ئەخاتە سەر •

مەولەوی‌ی لەوێدا ئەڵێ : دوای هۆنینەوەی کتێبەکەو ڕاگەیاندنــی شێخ عوسمانی تەوێڵە ـ خوا پلەی بەرز کاتەوە ـ کە پێغەمبەری دیـووەو ( بە بێ باسی چۆنێتی بینینەکە ) ئـەویش فـەرموویە : ئەمە نامەیـەکی خۆشەویست‌و پەسەندە لامان ، ئەمیش ناوی ناوە : ( العقيدة المرضية لدى جناب أفضل البرية ) وانــە : بیرو باوەڕی‌ی پەسـەند لای بەرێزترین دروست‌کراو •

ئەمەش دەقی پەسەندەکەیە :

| | |
|---|---|
| رسـالة جامعـــة المســائل | يحبها قلب ذوي الفضائل |
| وبعـــد مانظمتهـا وأخبـرا | وسيلة الخلق لخالق الورى |
| قطب الزمان شيخنا عثمـان | فاض على جنـابه الرضوان |
| بأنه لما رأى النبي الاكرما | صلى عليـه ربنـا وسـلما |
| يقـول : ذي رسالة الينـــا | محبـوبة مرضـــية لدينـــا |
| سميتهـا عقيـــدة مرضـية | لدى جنـاب أفضل البرية |
| صلى عليـه الله من نواله | وصـحبه وحـــزبه وآلـــه |
| بـه لنا قـد عمت العوائد | صحت وتمت بهـم العقائد |

ئەوەی شایانی باسە مەولەوی‌ی (ال)ی نەخستووەتە سـەر ناوەکەو لەوە ئەچێ مەبەستی ئەوە بێ ناوی‌ی ناوە بەوەی ئەو مەبەستە بگەیێنێ : جا ناوەکە ( العقيدة المرضية )بێ ، بەعەرەبی‌ی یا ( عەقیدەی مەرضیـە ) بێ

بــە شێوەی کوردیی ، وە هەر وەها پەسەندەکە وا ئەگەیێنێ کە ( لدی جناب أفضل البرية ) کەرتێ بێ لە ناوەکە ، بەڵام ڕەوشت وایە کە کەرتی دوایی‌ی لەم جۆرە ناوە درێژەدارانەدا ئەگرتێرێ •

---

**تیبینی :**
ژمارەی بەیتەکانی ( العقيدة المرضية ) بە پێی چاپەکە (٢٤٤٠) دانەیەو بە پێی دەست نووسەکە (٢٤٣٣) دانەیە سێ بەیت لــە دەستنووسەکەدا هەیە لــە چاپەکەدا نییە ، نۆ بەیتییشی لــەمدا هەیەو لەودا نییە ، بەیتێکییش : ( وجــود ممكنات ٠٠٠٠٠٠ ) دووپات کراوەتەوە لــە هــەردوو لاپەڕەی (١١٤ ، ١١٥)دا لــە دەستنووسەکەدا هەر لە شوێنی‌دووەمدا هەیە ، ئەگەر ئەم بەیتە سەرژمێر نەکەین‌و زیادەی هەردوو لا سەرژمێر کەین ژمارەیان ئەبێتە (٢٤٤٢) دانە ٠
ئەمەش جیاوازی‌ی هەیە لە گەڵ ئەوەی مامۆستا مەلا (عبدالكريم)ی مودەڕڕیسی لە پێشەکی‌ی دیوانی مەولەوی‌ی‌و لە کۆتایی‌ی ( الوسيلة في شرح الفضيلة )دا باسی کردووە کە (٢٤٥٢) بەیتە ٠

## سەرەتاو هۆی دانانی کتێبی : ( العقیدة المرضیة )

مەولەویی لـە سەر ڕەوشتو نەریتی ئیسلامیی پاش یارمـەتیی وەرگرتن لـە خودای بەخشندەی میهرەبان :

**بســـــم الله الرحمن الرحیم**

هۆنراوەکەی بە سوپاسو ستایشی خـودا دەست پێدەکات ، بـە جۆرێ کە هەر لەسەرەتاوە دەستنیشـانی نـاوەرۆکو مەبـەست بکات : ( براعـة الأستهلال )[١] :ـ

**زوبدەی عەقیدەو خۆلاصـەی کـەلام**
**هـەر لـە تۆ بۆ تۆس حەمدو ثەنای تام[٢]**

نوێشکی بڕواو پوختـەی وتـار یا زانیـاریی کـەلام ئەمەیە : لـە خۆتەوەیەو هەر بۆ خۆتە سوپاس ستایشی تەواو ؛ یەکەم لەبەر ئـەوە کە هەر خـۆت تواناداریی بۆ بەجێهێنانیان بەبۆنەی ئەوەوە کە هەر خۆتی سەرچاوەی هـەموو خێرو بێرو ستایشی هـەرچییتر بکـەین چونـکە دەستکردیی خۆتە ، هەر بۆ خۆت دەگەڕێتەوە .

---

(١) براعة الاستهلال : جوانکارییەکی ڕەوانبێژییە ، مەبەست ئەوەیە لەسەرەتای کتێب یا چامـــەوە شتێی وا هـــەبێ کـە ناوەرۆك دەستنیشان بکات ، لێرەدا وشەی ( عەقیدە ، **کەلام** ... ) ئەوە ئەگەیێنن کە کتێبەکە باسی زانیاریی کەلام دەکات ، هەر وەها ناوەرۆکی بەیتەکانی تریش هەر لە زانیارییەکەوە وەرگیراون ، ئەمەش جۆرێکی ترە .

(٢) زوبدة ( زبدة ) : ئوێشك ، پوختە . عەقیدە ( عقیدة ) : بیرو باوەڕ . خۆلاصە ( خلاصة ) : پوختە . کەلام ( کلام ) : وتار ، وتە ، وتەی خووا ، زانیاریی بیرو باوەڕە بنەڕەتییەکانی ئایینی ئیسلام . بۆ تۆس : بۆ تۆیە .

پاش ئەوەی ئەرکی سوپاس و ستایشی بەجێهێناو سوپاسیش لەسەر نیعمەتە ، ئەیەوێ هەندێ لە نیعمەتەکانی خودا باس کات ، گەورەترینیشیان ڕژاندنی ڕووناکیی باوەڕو ناسینی ڕاستیی خۆیەتی بەسەر دڵی بەندەکانیا • لەبەر ئەوە ئەڵێ :

**هەر خۆتیی بۆ خۆت بورهان ، دیتر بەس**
**بەشی خۆی تێکەڵ ناوێ بکا کەس(٣)**

هەر خۆتی بەڵگەی ڕاستیی بۆخۆت و ئەگەر خۆت نیشانی دڵی ئارەزوومەندان نەدەی بە هیچ جۆرێ ناتوانن بتناسن و ، نابێ کەس لە خۆی بایی بێ و بڵێ : من بەڵگەی بێگومان دێنمەوە بۆ خوایەتیت لەسەر ڕێبازی فەلسەفەو کەلام و زانیاریی ؟ چونکە ئەوانە داد نادەن و ئەگەر دوودڵیشی ، گوێ شل کە لەمە :

**کەنارەی صەحرا نادیارییە**
**بینایی عوقوول ئاومراوارییە(٤)**
**( ضیق النفس )یە ، هەناسەی نایە**
**دانش ، پێی دەلیل ( عرق النسا)یە(٥)**

---

(٣) بورهان ( برهان ) : زازاوەیەکی مەنتیقە ، مەبەست ئەو بەڵگەیە کە سەرەتاکانیی لە ڕواڵەت و لە کەرەسەدا ڕاست و بێ گومان بن • دیتر ، ئیتر • ناوێ : نابێ •

(٤) کەنارە : کەنار ، لێوار ، قەراخ • صەحرا ( صحراء ) چۆڵ ، بیابان مەبەست بیابانی ناسینی خودایە • عوقوول ( عقول ) : کۆی عەقلە ( عقل ) : مەبەست ئەو هێزە نهێنییەی مرۆڤە کە توانای هەڵوەشاندن و لێکدان و ڕێك خستنی زانراوەکانی هەیە ، بۆ گەیشتن بە نەزانراو ، یا ئەو هێزە نهێنییەیە کە توانای بڕیاری هەیە • ئاومرواریی : نەخۆشیی ئاوهاتنیی چاو لە سەرەتاوە ، کە لە ئەنجامدا سەر ئەکێشی بۆ کوێریی ، مەبەست لێرەدا دۆخی پێش کوێرییە •

(٥) ( ضیق النفس ) هەناسە توندیی ، نەخۆشییەکی تایبەتە ئەو

کەنارو لێواری دەریای خوداناسین دیاریی نەکراوەو پایانی نییە لەگەڵ ئەوەشدا چاوی عەقڵ ئاویی هاتووەو زەردایییەکی ماوە زانینیش تووشی هەناسە توندیی بووەو خەفەیە •

بەڵگەش پێی تووشی ئێش و ئازار بووەو ڕەق هەڵگەڕاوە چا ئەگەر ئەمە باری عەقڵو زانین و بەڵگە بێ ئیتر :ـ

**عیرفان بەوانە کەی حاصڵ دەوێ ؟**
**بەو پێ ئەو صەحرا چلۆن طەی دەوێ ؟(٦)**

ناسینی خودا بەو عەقڵو زانین و بەڵگە نەخۆشانە کەی بەدەست دێ ؟

بەو پێ ڕەق و پڕ ئازارە ئەو بیابانە بێپایانە چۆن ئەبڕرێ ؟
کە وابوو با لافی ناسینی خودا بە هێزی ژیریی و زەبری زانین و توانای بەڵگە لێ نەدەین :ـ

---

دییاردەی هەیە • ( عرق النسا ) : نەخۆشییەکە لە ڕۆماتیزم ئەچێ مرۆف تووشیی ئازاری قولوقاچ ئەکاو هەلسو کەوتی لێ ئەبڕێ •
دانش : زانیین ، لە سەر مەسرعیی پێشووە ،
پێی دەلیل : لە پەراوێزی چاپەکەدا : ( دەلیل پێی ) •

(٦) عیرفان ( عرفان ) : ناسیین ، زاراوەیەکە لە سۆفییگەرییدا پتر بەکار دێنرێ ، مەبەستییان پلەیەکی تایبەتیی خواناسیینە کە لە خۆدەرخستنی خۆیەوە بۆ دڵی ئارەزوودارانو خۆشەویستانی ڕوودەدات •
دەوێ : دەبێ • جلۆن : چۆن • طەی ( طي ) : پێچانەوە ، مەبەست لێرەدا بڕینی ماوەیە •

**چاك واتە خەیاڵ بێ تەقریب نەکەین**
**مەعلوومە تۆ تۆی ، ئێمەیچ خۆ ئێمەین(٧)**

پاش وایە خەیاڵی دوور لە مەبەست نەکەینو دان بە پێچارەیی‌ی خۆماندا بنێین ، شتێکی ئاشکرایە تۆ تۆی ، بەو هەموو شکۆو دەسەڵاتو گەورەییەوەو ئێمەش خۆ هەر خۆمانیین بەم هەموو نەزانیی‌و بێهێزییەوە . تا بەم جۆرە مەولەوی‌ی سوپاس‌و ستایشی پەروەردگاری بەجێ هێنا لەگەڵ دەست نیشان کردنی مەبەستو دەربڕینی بڕوای تایبەتی‌ی خۆی بەرانبەر مەسەلەی خواناسین هەر چەند هۆنراوەکەشی سەراسەر لەسەر ئەم ڕێبازە نەرۆیشتووە ؟ چونکە ئەم ڕێگە سۆفیگەرییە هی‌ی هەموان نییەو تەنها مەولەوی‌ی ویستوویە لەسەر شێوەی : ( براعة الأستهلال ) ئەوە بگەیێنی کە ئەم ڕێبازەش شوێنێکی دیاری هەیە لە کتێبەکەدا .

لە پاشا هەر لەسەر ئەو نەریتەی باسمان کرد دەست نەکانە بەجێهێنانی درووود لەسەر پێغەمبەر ( د.خ ) بە شێوەیەکی بەکجار پەسەندو بێوێنەو تێیدا بەرز ئەبێتەوە بۆ باڵاترین لووتکەی شیعرو ئاسکی‌ی خەیاڵو ئەڵێ :-

**هەورەکەی ڕەحمەت ڕووی سەمای کەرەم**
**صەلاتو سەلام ، کەی‌کەم ئێستەکەم(٨)**

---

(٧) تەقریب ( تقریب ) : نزیك خستنەوەی ئەنجامی بەڵگە لە مەبەست ، زاراوەیەکی زانیاری‌ی ( مناظرة )یە مەبەست لە بێ‌تەقریب لێرەوا شتی بێجێیە . ئێمەیچ : ئێمەیش .

(٨) ڕەحمەت ( رحمة ) : سۆز ، بەزەیی‌ی . سەما ( سماء ) : ئاسمان . کەرەم ( کرم ) بەخشندەیی‌ی . صەلاتو سەلام ( صلاة وسلام ) درووودو سڵاو کەی‌کەم‌ئێسەکەم : بەخوڕ ، بەتاو ، ڕێژەنە بکاو تاو بە دوای تاودا بێنێ ، وشەیەکی داڕێژراوە بەکار دێنرێ بۆ ئەو مەبەستانەی پێشوو لە هەندێ ناوچەی کوردەوارییدا .

ئای لەم بیرە وردو ئەندێشە ناسکەو هەی لەم وێنە پرشنگدارو چالاكو پڕ جمۆجوولە ! ئەوا هەور بەو هەموو خێروبێرەیەوە بەتایبەت هیی ڕەحمەتیش بێو بەکوێشەوە بێ؟ بە ڕووی ئاسمانی کەرەمو بەخشندەیی خوداوە ئەم هەورە چی بکات؟ سڵاوو درووودی یەك لە دوای یەك :

**بێرێو بڕێژێو بدا وە هەمدا**
**وە سەر مەزرەعەی ڕۆحی خاتەمدا(٩)**

بێنێو بدا بە یەکداو ببڕێژێ بە سەر کێڵگەی گیانی کۆتاییی پێغەمەراندا، بەڵێ بەسەر (کێڵگە)ی گیانی پاکیدا بۆ ئەوەی ئەو پرۆژەی هیدایەتو ئاینیڕاستییە پتر گەشە کاو بەرهەمیی پەیاپەی بداتە نەوە پاش نەوەی کۆمەڵی ئادەمیزادو بەمەشەوە نەوەستێ بەڵکوو :

**سەرواز کا سەراو وەهەر شەتاودا**
**وەسەر سەوزەی پاك ئالو ئەصحابدا(١٠)**

لەوێشەوە ئەو درووودو سڵاوە سەرکا بە هەموو جۆگەو ڕووبارەکاندا تا ئەدا بەسەر سەوزەی خاوێنی ئالو یارانیدا بە جۆرێ پێی گەشە کاو

(٩) بێرێ : بێنێ · بدا وە هەمدا : بدا بە یەکدا ، کینایەیە لە زۆریی تاوەکانو چڕیییان · مەزرەعە ( مزرعة ) : کێڵگە ·
خاتەم ( خاتم ) : پێغەمەری موسولمانان ( محمد ) (د·خ) خاتەمی پێ ئەڵێن (١) لەبەر ئەوەی مۆری پێغەمەرێتی ئەوانی تریی کردووە ·
(٢) لەبەر ئەوە کۆتاییی هەموویانە ·

(١٠) سەرواز : سەرڕێژ · شەتاو : جۆگەو ڕووبار · سەوزەی پاك : لێرەدا سەوزەی بەکارهێناو بۆ پێغەمەر مەزرەعە ، چونکە بێ کێلگەژیان نابڕێتە سەرو لەبەر ئەوە ئەمان پارچەیەك سەوزەی ئەو کێڵگەن ·

دەشتو چیای خودا پەرستیو ئاینی پێ برازێنەوەو هەر بەردەوام بێ لەم بڵاو بوونەوەدا :ـ

**تا بدا پرتەو وەسەر وجوددا**
**ئیمان لە ئەسرار ئەهلی شوهوددا(١١)**

ئەم درووده بەردەوام بێ لە ڕێژەنە بەسەر ناوبراواندا هەتا باوەڕ لە نهێنیی خودا ناسە ڕاستیەکاندا تیشکو ڕووناکیی ئەخاتە سەر جیهانو بوونەوەر ، لە هەر وەرزێکیدابێ خۆ دیارە ئەمە نەبڕاوەیە دەبا دروودەکەش هەر وابێ •

ئەنجا مەولەویی وردە وردە ئەیەوێ بچێتە ناو مەبەستەوە لەبەر ئەوە ئامۆژگاریەکی ناسکیی خوێنەر ئەکاو ئەڵێ :

**بەعد ، گشت ئەجزات بوێ وە دەماخ**
**کام دەماخ ؟ وە بۆی یادی خودا چاخ(١٢)**

لە پاشا با هەموو ئەندامی لە شت ببێ بەلووت کام لووت ؟ ئەوەی ئالوودەی بۆنی بێیایەخو نرخی ئەم جیهانە نەماوەبە ؟ نەء • ئەوەی بە بۆنی یادی خودا پەروەردە بووەو خۆی گرتووە ، بەڵێ با هەموو ئەندامت ئامادەی بۆن کردن بێ :ـ

---

(١١) پرتەو : تیشکو ڕووناکیی ، لە چاپەکەدا : ( تابدا و پرتاو ) پرتاو : ڕێژەنە ، لێزەمە ، نوسخە خەتەکەم هەڵبژارد چونکە ڕووناکیی بۆ باوەڕ گونجاوترە لە لێزەمەو تاو • وجوود : بوونەوەر ، جیهان • ئەسرار ( أسرار ) کۆی سیرڕە ( سر ) مەبەست شوێنێکی پەنهانە لە دڵیی مرۆڤا جێی پێشوازیی باوەڕو ڕووناکیی جیهانی باڵایە • ئەهلی شوهوود ( أهل الشهود ) : ئەوانەی خودا دەبینن واتە دەیناسن بەجۆرێ وەك ببینیین وایە •

(١٢) بەعد ( بعد ) : لەپاشان ، ئەمە لەسەر نەریتی باو بووە ، کە مەبەستی کتێبو نامەیان لە سەرەتاکەی پێ جیا کردووەتەوە • دەماخ : لووت : کەپوو • چاخ : تەواو ، دروست ، قەڵەو •

**نەك نەفحەی دەمدەم ( خالق الأنام )(١٣)**
**یا فەیضی ئەنفاس ئەصفییای کیرام**

**لە ناکاو بۆی بێت چابوك کا گوزەر**
**بوێ وە حەسرەت نەوی‌ی باخەبەر(١٤)**

نەوەك بۆنی خۆشی ، کات‌کاتی پەروەردگاری هەموو کەسان(١٥) ، یا لێشاوی هەناسەی دڵ خاوێنە بەڕێزەکان ، لە ناکاو خێرا تێپەڕ کاو بۆت ببێ بە ئاخ‌و داخ‌و دڵسارده‌ی کە بێ ئاگا بوو بێت‌و نەت قۆزیبوێتەوە ، بەڵێ با هەموو ئەندامت هەستیار بێ چونکە ئێستە دەست بە مەبەست دەگەین‌و لەوانەیە لەمەودووا لە هەر ساتێکا ئەوبۆن‌و هەناسە هەڵکا ، وا لێرەدا باسی باوەڕ دێنێتە کایەوە دەسا گوێت لێ بێ ، بزانە چ بۆن‌و بەرامەیەکی خۆش بڵاو دەکاتەوە .

---

(١٣) نەفحە ( نفحة ) بۆنی خۆش · دەمدەم : کات‌کات ( خالق الأنام ) : دروست‌کەری خەڵکان · فەیض ( فیض ) لێشاو · ئەنفاس ( انفاس ) کۆی نەفەسە ( نفس ) هەناسە ، کینایەیە لە تینی پیاو چاکان بۆ سەر دڵی خەڵکانی‌تر · ئەصفیا ( اصفیا ) کۆی صەفی ( صفی )یە : پاڵاوتەو خاوێن‌و بێ‌گەرد · کیرام (کرام) کۆی کەرییم ( کریم )ە : بەخشندە ·

(١٤) لەناکاو : لەپڕ ، لە چاپەکەدا ( وەناکاو ) · بۆی : بۆنی ، یا بۆ ئەو · چابوك : خێرا · گوزەر : تێپەڕ · بوێ : ببێ · حەسرەت ( حسرة ) خەم‌و پەژارە لەسەر لە دەستچوو · نەوی‌ی : نەبی‌ی باخەبەر : وشیار ·

(١٥) مەولەوی‌ی لەم شوێنەدا هێمای کردووە بۆ فەرموودەی : ( الا ان لله في ايام دهركم نفحات ، ألا فتعرضوا لها ) واتە خودا لە ڕۆژانی ژیانتانا بۆنی خۆش بڵاو دەکاتەوە ، ئاگاداربن خۆتانی بدەنە بەر ·

**هێمای هەوای ئەو قەدییم پەیمانە**
**پێمانە وەك ئـەهل هـەوا پەیمانە(١٦)**

هێشتا سەودایی‌ی‌و خۆشەویستی‌ی ئەو پەیحانە کۆنەی ڕۆژی « قالوا بلی » (قال‌و بەلاّ)مان ( پەیمانی بڕواو دان نان بە خودایەتی‌ی خودا لە ئەزەڵدا ) لـە دڵدایـەو جێگیرە ، وەك ئارەزووی مەیخـۆرەکان بۆ مەی‌و پیاڵە .

وە لەبەر ئەوینی ئەو پەیمانە :

**دەلاڵێینەوە ، صەریح : ئییما ، نە**
**های ساقی‌ی ئامان ، وەختی ئییمانە(١٧)**

دەپاڕێینەوە بە ئەشکرا نەك بەڕەمزو ئیشارە . های مەی گێڕی ڕاستی‌ی باسی ئیمان لە کایەدایە ؛ بەڵکو کارێکی وا بکەی کە بتوانـم بە باشـی‌ی ڕافـەی کەم‌و لێی بکۆڵمەوەو ، ئێستەش سەردەمێتی :ـ

(١٦) هێمای : هێشتا ، هەوا : ئارەزوو ، ئەوین ، خۆشەویستی‌ی ، سەووایی‌ی . قەدییم پەیمان : پەیمانی کۆن : مەبەست ئەوپەیمانە ئەزەلییەیە کە ئادەمییزاد دایە خودا ، کـە دان بـە خودایەتییدا بنێ : ( واذ أخذ ربك من بني آدم من ظهورهم ذريتهم واشهدهم على انفسـهم ألست بربكـم قالوا بلى ) لە ئایـەتی : (٧٢) لـە سوورەتی : ( الاعراف ) پێمانە : لامانە ، هێشتا هەر لەسەرییی . ئەهلی هەوا پەیمانە : بەرەی ئارەزوو دارانی پەیمانەو جامی مەی خواردنەوە ، مەبەست مەی‌خۆرەکانە .
لـە نێوان پەیمانەی یەکـەم‌و دووەم‌و پێمانەدا جیناس هـەیە ، بەهەردو ڕێنووس . لە هی‌ی نوێدا یەکێکیان ناتەواوە .

(١٧) دەلاڵێینەوە : دەپاڕێینەوە . ئییمانە : یەکەمیان ڕوون کردنەوەی وشەی صەرییحە ، واتە نەك ئییماو ڕەمز مەبەستی‌ی دووەمییش ئاشکرایەو جیناسیان لە نێواندایە .
های وشەی بانگ کردنە . ئامان : دەخیل ، بۆ هانا بردن بە کار دێنیرێ جیناسی ناتەواو پێك دێنێ لەگەڵ وشەی ( ئییما ، نە )و ( ئییمانە )دا .

**هەر بەهار ناوێ دەی لە پەیمانە**
**فرصەت دەفەوتێ دەی لە پەیمانە(١٨)**

هەر هەمیشە بەهار نابێ ، مانگی دەیو ناوەڕاستی زستانمان لەبەرەو ، هەل دەفەوتێ دەسا هەڵسە تاو دەرە پیالە ؟ خۆ تۆ لـە هیچ تناقێکت کـەم نیـە :ــ

**تۆ سەبووی مەی پێت ، جام جانفیدای ڕێت(١٩)**
**دڵ چاوی وا لێت : سا با بێت تا بێت**

**زوان وە بێ من وەسەر تەقریردا**
**خامە وە بێ دەس وە ڕووی تەحریردا(٢٠)**

خۆ تۆ کووپەی مەیت پێیە ، جامیش بە قوربانی ڕێتەو ئامادەی جێبەجێ کردنی فەرمانتە ، دڵیی ئارەزوومەندانیش چاوەڕوانتە ، کـە

---

(١٨) ناوێ : نابێ ، دەی : یەکەم : مانگی ناوەڕاستی زستان ، دووەم بۆ دەنگدانو فرمان جێبەجێ کردن بە خێرایی‌ی بە کار دێنرێ • پەیمانە : یەکەم پێك هاتووە لە (پەی ، مان ، ە) وانە لە بەرمانەو هەرئەبێ پێی بگەین ، دووەمییش بە واتە پیالەیە ، لەم بەیتەدا دوو جیناسی تەواوی‌ی ئاشکرا هەیە •

(١٩) سەبوو : کووپە • جان فیدا : گیان بەختکەر ، قوربانی‌ی • سا با بێت : دەی با مەی بێت • تا بێت : وەکو مەولەوێ خۆی لە پەراوێزێکدا باسی کردووە ئەتوانرێ پەیوەند کرێ بـە بـەیتی پاشەوە وەکو ئێمە ئەسەری ڕۆییشتیین ، وە ئەشێ بێ بپچڕێنرێ ، لەم بارەدا دەبەستەکەی ئەوەیە : هەتا بەروو بڕوومی مەیەکە بێت ، کە ئەوەیە لە بەیتەکەی پاشەوەدا باسی‌ی دەکات •

(٢٠) زوان : زمان • تەقریر ( تقریر ) وتنەوەی زانیاری‌یو شتی‌یتر خامە : **قەڵەم تەحریر ( تحریر )** نووسیین لە چاپەکەدا لەباتی‌ی : ( وەسەر ) ، ( لەسەر ) وە لە باتی‌ی ( وەڕووی ) ، ( وەسەر ) ، دیارە خەتەکە بە جێ ترە •

وابو ؟ بسا مەی بێت بۆ ئەوەی مــەســتو خومارم کاو لــە تیینی گــەدەسیدا وجۆشی دەروونم زمانم بە بێ ئاگاداری خۆم بێتە سەر تەقریری مەسەلەی ئیمانو قەڵەمیش بە بێ دەستو پەنجە بێتە سەر نووسینی باسەکە ٠ ئاوا

ئاوا ئەبێ پێشەکیی دانانو بەناسکیی چوونە ناو باسەوە ، ئەگەر ئەمە شیعر نەبێ ئەی ئەبێ شیعر چی بێ ؟! بە ڕاستیی لە ناسکیی خەیاڵو وردیی بیردا لووتکەی هەرە بەرزی شیعری گرتووە ، کە بە هیچ جۆرێ لــە شێوازی هۆنراوە زانیاریەکان ناچێ ، جگە لــەو هەموو جوانکاریە بەجێیانەی تیایاندا بەدیی ئەکرێ ٠

لە پاش ئەمە دێتە سەر پێناسەی ئیمانو دابەش کردنی بــە پێی زانیاریی کەلام گەلێ لەسەری ئەڕوا تا دێتە سەر باسی تەکلیف بە ئیمانو یەکەم جار تەنگو چەڵەمەکە ئەخاتە بەر چاوو ئەڵێ :ــ

**ئیمان عەرەضەو کەیفی نەفسانیی**
**نەك بە ئیختییار فیعلی ئینسانیی(٢١)**

ئیمانو باوەڕ عەرەضەو هەر لەدڵی خاوەن باوەڕدا هەیە بــەڵام لــە بەشی چۆنێتیە (الکیف)و زانایان دەڵێن تەکلیف هــەر بەکردار ئەبــێ ؟

---

(٢١) عەرەض ( العرض ) : ئەو شتەی کە بە شتێکی ترەوە وەستاوە ، ئەرەستۆ بوونەوەر ( الموجود )ی جگە لە خوا ئەکا بە دوو بەشەوە (١) گەوهــەر ، ئەوەیە کــە بــە خۆیــەوە وەستابێ وپێویستی بەشتیی تر نەبێ ٠ وەك تەن ٠ (٢) عەرەض : ئەوەیە بە شتێکی ترەوە وەستابێ ٠ عەرەضییش ئەکات بە نۆ بەشەوە یەکێکیان چۆنێتییە ( الکیف ) وەك ، ڕەنگو تامو ڕەقیی و نەرمیی و ٠٠٠ ئەمییش هــەندێ جۆری نەفسانییە هەر لە مێشکدا هــەیە ، وەك دڵخۆشیی ، زوبریی ، بڕوا ، دڵنیایی ، ترس ٠٠٠
فیعلی ئینسانیی : یەکێکی تر ، لە نۆ بەشەکەی عەرەض فیعلە ( فعل ) واتە کردار : وەك ، خواردن خواردنەوە ، لێدان ٠٠٠

چونکە مرۆڤ توانای هەر بەسەر کردارا هەیە ؟ کەوانە ئەبێ بۆچی خودا داوای ئیمـان هێنـانمان لـێ بکات ؟! کە دەسەڵاتیشمان بە سەریدا نییە؟ ئەمە وەڵامەکەیەتی :ــ

**بەلام ئەسباب تەحصیلی یەکسـەر**
**گشت ئیختیيارییـن وەك صەرفی نەظەر(٢١)**

دۆکانی هێنانەدیی باوەڕ هەموو بە ئارەزوو توانـای خۆمانە وەك : ئاڕاستەی تێبینیی ، کە کردارێکی مێشکیی مرۆڤە ؛ کە وابوو ..

**تەکلیف بە ئیمان بێ ئیختیياریی**
**لە هەوری سەطوەت باریی نەرباریی(٢٢)**
**وە بادی تەکلیف بەو ئەسبابەسە**
**ئیمانییچ سـەوزەی ئـەو سەراوەسە(٢٤)**

---

(٢٢) ئەسباب ( اسباب ) : کۆی سەبەبە ( سبب ) : هۆ . تەحصییل ( تحصيل ) : پـەیدا کـردن ، هێنانەدیی ، کرداری فێربوون . ئیختیاریی : ئەو کردەوەی کە بە ئارەزووی خۆمان بێ‌و پێویست نەکرابێ لەسەرمان . صەرف ( صرف ) : ئاڕاستەکردن ، نەظەر ( نظر ) : تێبینیی ، زاراوەیەکی مەنتیقە مەبەست ڕیزکردن‌و ڕێکخستنی هەندێ لـە زانراوەکانی مرۆڤە بۆ تێگەیشتنە شـتی نەزانراو ، ئەم کارە لە پێناسەو بەڵگەدا ڕوودەدات‌و دوو بزوانی تێدایە یەکەم پیاچوونەوەی زانراوەکان دووەم گەڕانەوە بۆ سەر مەبەست .

(٢٣) تەکلییف ( تكليف ) : شتێکی گران خستنە سەر شانی یەکێ ، داوا کردنی هەستانی یەکێ بە کارێکی گران . سەطوەت (سطوة) : باری داگییر کردن‌و بە کار هێنانی ڕەقیی . باریی : یەکـەم خووا ، عەرەبییەو ئیسمی فاعیلی ( برأ )یە ، واتە دروستی‌کرد دووەمییش کرداری ڕابووردووی بارینە دیارە جناسی تەواویان لە نێوانیدا هەیە . نەر : ئەگەر .

(٢٤) باد : با ، ئەسباوەسە : ئەسبابەیە . ئیمانیيچ : ئیمانییش . سەراوەسە : سەراوەیە ، لە چاپەکەدا : (آسیاوسە) : ئەسیاوەسە .

وەردی هەفت گاسن زۆر نەختی تەوێ
بێ دۆچ هەرێز شۆرکات نەوێ(٢٥)

سا ئەر سەوزی کرد نەضلێکی هەیە
وەرنە ، چ لزووم ؟ مەزرەعەی خۆیە(٢٦)

داوا کردنی باوەڕ هێنان ئەگەر لە هەوری بێباکیی پەروەردگار ڕووی‌دا ( کە ڕۆژیشی داوەو هەمیشە ڕوویش ئەدا ) ئەوە مەبەست داوا کردنی بەجێ‌هێنانی هۆکانێتی وەك تێبینیو وردبوونەوەو بڕوایش هەر بەوە سەوز نەبێ ، بەڵام زەویەکی خۆش کراوو چەند جار کێڵراوی بێ خوێو بژاری ئەوێ • سەرەڕای ئەمەیش ، سەوز بوونی ئیمان هەر ئەگەڕێتەوە بۆ خودا جا ئەگەر کردی ئەوە لە گەورەییی خۆیەوەیە ئەگەر نەیشی کرد هیچ پێویست نیە لە سەری ؛ چونکە کێڵگەی خۆیەو ئازادە تێیدا •

ئەمە هێمایە بۆ دوو مەرجی بنەڕەتیی گەورە لەم مەسەلەیەدا یەکەم ئامادەییی شوێن : ( استعداد المحل )کە گومان نیە مەرجێکی سەرەکیەو فەرمانی بەجێیە لە زۆربەی شوێناندا دووەم نەبوونی کۆسپو دژ وەك بیرو باوەڕی کۆنی نالەبارو ئارەزووو گەلێ شتی‌تر •

جا لێکدانەوەی هێماکان با لەسەر خۆت بێ ، چونکە پاش زانینی دوو مەرجەکە دۆزینەوەیان ئاسانە •

ئەنجا پاش دوانێکی ترو بەبۆنەی لابردنی ئەو گومانەی کە لە

---

(٢٥) وەردی هەفت گاسن : وەردی هەوت جار کێڵراو • نەخت : پوختو بێ‌بژار • تەوێ : ئەوێ ، دەوێ • دۆچ : گیایەکە بژار ئەکرێ لە کێڵگەدا • شۆرکات : خوێدار • نەوێ : نەبێ •

(٢٦) فەضلێکی هەیە : زیادە چاکەیەکی هەیە • وەرنە : ئەگەر سەوزی نەکرد •

خوێندنەوەی سەرەناوە ئەچەقێتە مێشك كـە جگـە لـە باوەڕی بینینیی (شهودی) هیچ جۆرێكی تر كەڵكی نییە ، دێت لێرەدا ئەو گومانە لە مێشك هەڵئەكێشێو شوێنەكەی تیمار ئەكات بە ڕاستیی ئەوەی :

**موكتەسەب دەوێ ئیمـــان بێ تەردیید**
**لە كەشف ، لە دەلیل ، یاخۆ لە تەقلیید(٢٧)**

باوەڕ لە سێ ڕێگەوە دەست ئەكەوێ : یەكەم لـە لاچوونی پەردە لە ناو خوداو بەندەدا : (كشف) ، ئەمە بڕوای خواناسە گەورەكانە ، دووەم لـە بەڵگە وەكو ئیمانی فەیلەسووفو زاناكان سێهەم لە چاوالێكردن زۆرك بڕوای هەندێ خاوەن پیشەكانو جەماوەر ٠

ئەنجا لە هەر سێ جۆرەكە ئەدوێو دان بەوەدا دەنێ كـە تەنانەت هیی چاولێكەریش هەر دروستەو هیچ تەنگو چەڵەمەی تێدا نیە ٠ وەهەر لەسەر ئەم باسانە دەڕوا ، تا ئەگاتە دەربڕینی هەڵوێستی خۆیو ئـەڵێ :ـ

**ڕوتبەی ئەووەلیچ ئەوەند ئەعلایە**
**دەسی ئارەزووی من لێی كۆتایە(٢٨)**

پایەی یەكەم ئەوەندە بەرزە نەك نەدستی خۆمو بەس بەڵكوو(٢٨)

---

(٢٧) دەوێ : دەبێ ٠ تەردیید ( تردید ) : گومان ٠ كەشف ( كشف ) : لاچوونی پەردە لەنێوان خوداو بەندەدا ، دەركەوتنێكی ڕوونو بەهێزو بێبەڵگە ٠ تەقلیید ( تقلید ) : لاسایی ، دوا كەوتنی یەكێ یا كۆمەڵێك لە باوەڕدا بە بێ بەڵگە ٠ لە ڕاستییدا بەڵگەیەكی نهێنی هەیە وەكو بڵێ : من دڵنیام لە زانایی ئـەو كەسەی كە دوای كەوتووم ، لەبەر ئەوە ئەبێ ڕاستبێ لە باوەڕەكەیدا ٠

(٢٨) ئەووەلیچ : یەكەمییش ٠ كۆتا : كورت ٠

( ما يمكــن لذا يمكن اللاخير
والله على الممكــن قــدير ) ...(١٢٣)

بیرو باوەڕی فەلسەفەی بێهێزو نەبەکام بەر شەق دەو باوەڕت بێ بــە چیرۆکی میعراج •

مایەو شێوە : (المادة والصورة) لەم ناوەدا لایە ؛ چونکە ڕاست نین و هیچ تەنێ نە لەسەر زەوی ی و نە لە ئاســمان لــەوان پێك نەهاتووە ، لــە ئەتۆم و گەردیلە دروستبووە ، هەر وەکو زانا موسەڵمانــەکان ئەیڵێن • تۆش هەندێ خۆت هیلاك کە لەم ڕیڕەوەدا •

دیارە کە هەیوولاو صورەتێ هەڵوەشانەوە ، ئیتر تەنەکان وەك یەك ئەبن و ئەوەی بۆتەنی سەر زەوی ی شیاوبێ بۆ تەنی ئاسمانییش هەر وایــە ، خواش توانایە بەسەر هەموو شیاوێکا ، ئەنجا مەولەوی ی ئەیەوێ چــارە سەری تەنگ و چەڵەمەیەکی تر بکات و ئەڵێ :

( ما كان ما بي بفي بحمده
ســبحان الذي أسرى بعبــده )

ئەو دیاردەو بەراتەی منی لێ بەهرەوەر بووم ، بەس نیە بۆ سوپاسی خوداو ، پێویست بــە شتی گــەلێ گرنگتر هــەیە ؛ کــە وابوو بــا شەوڕەوییەکەی پێغەمەر (د•خ) بکەین بە ستایشی خوداو بڵێین : پــاك و بێخەوشە ئەوەی شەو ڕەوی ی بــە بەندەی خۆی کرد

---

(١٢٣) ما يمكن لذا يمكن للأخير : تەوەی بۆ ئەم بشێ بۆ ئــەوییش ئەشێ • والله على الممكن قدير : خودایش بــە ســەر شیاودا توانایە •

ئـا بـەم ناسکیبە مەسـەلەی شـەوڕەوی‌ی جارێـکی‌تر بۆ ڕاست کردنەوەی هەندێ بیرو باوەڕی خێچو خوار هێنایە کایەوە ، لەبەر ئـەوە دەست بەلێکدانەوەی ئایەتەکە دەکاو ئەڵێ :

**ظاهیـــری « اسری بعبده » دەکـــات**
**میعراج ( بالیقظه )و ( بالشخص ) ئیثبات ۰۰۰(١٢٤)**

**نەك بە خەو ، یا خەیر ( بالروح فقط )**
**ئەوە زەعمێکە بێ مزەو سەقەط ۰۰۰(١٢٥)**

**چلۆن ئەر بـە ڕۆح یا مەنام دەبوو**
**باعیثی ئینکار بۆ عەوام دەبوو ؟ ۰۰۰(١٢٦)**

بەڵێ لە : ( اسری بعبده ) وا دەرئەکەوێ : یەکەم : شەوڕەوی‌ی هەر بەخودی خۆی بوو ؛ چونکە (عبد) گیانو تەنە هـەر دووکیان ، دووەم : لـە باری بێداریدا بووە ؛ چونکە خودا کردارەکە ئەداتە پاڵ خـــۆی‌و

---

(١٢٤) ظاهیـر ( ظاهـر ) : ئەوەی بـە بێ پاساودان : ( التأویل ) وەرگیبرێ لە ئایەتەکە ۰ بالیقظة : لە سەردەمی بە خەبەرییدا ۰ بالشخص : هەر بە خۆی ، بە گیانو تەنەوە ۰

(١٢٥) نەك بە خەو : دژی : ( بالیقظه )یە ۰ بالروح فقط : بەڕەوانی ڕووت ، دژی : ( بالشخص )ە ۰ مزە : سوود ، یا مەزە : تامو چەش ۰ سەقەط : لە کەڵك کەوتوو ۰

(١٢٦) چلۆن : چۆن ۰ ئەر : ئەگەر ۰ مەنام ( منام ) : خەو ۰ باعیث ( باعث ) : هۆ ، عەوام ( عوام ) : جەماوەر ، واتە هی‌ی بت پەرستەکان ۰

ئەگەر لەخەودا بووایە هیچ هورنەو جووانییەکی تێدا نەئەبوو(١٢٧) .

نەخەیر ، نە بە خەو بووەو نە بە گیانـی ڕووت ، ئەمە گومانێکی بێ تامو شەلو شێواوە ؟ چونکە ئەگـەر وەها بووایە چـۆن جـەماوەری کافرەکان ئینکاریان ئەکرد ؟!

لێرەدا تەنگو چەڵەمەی هەندێ فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) دێتە بەرەوە کە وا ئەگەیێنێ میعراج هەر بەگیان بووە ، مەولەوییش بەم جۆرە وەڵامی ئەداتەوە :

تەحریرێ کە وا شیرین بێو ئەحەق
( بین الاحـادیث بـذا یوفـق )(١٢٨)

موکەڕڕەڕ بووگە میعـراجو فوتووح
( مـرة بالشخص کـرة بالروح )(١٢٩)

دەربڕینێ : (تحریر) کە جوانو شایستی باس کردن بێ ئەوەیە کە بەرز بوونەوە چەند جارێك ڕووی داوە ، هەندێکیان بەگیانو هەندێکی

---

(١٢٧) لێرەدا مەولەوی ( میعراج )و ( ئیسرا )ی تێکەڵ کردووە چونکە ئایەتەکە باسی شەوڕەوی دەکات نەك بەرزبوونەوە ، نازانم بە چ خەیاڵێك ئەمەی کردووە ؟! .

(١٢٨) تەحریر ( تحـریر ) نووسین ، دەرخستنی مەبەسـت . شیرین : جوان . ئەحەق ( أحق ) : شایستەتر . بذا : بە هۆی ئەمەوە ، هێمایە بۆ بەیتەکەی پاشەوە .

(١٢٩) موکەڕڕەڕ : دووپات . بووگە : بووە . ( مرة بالشخص مرة بالروح لیلا ) جارێ بە خودی خۆی جارێکیتر بە ڕەوان لە شەودا ، وشەی : ( لیلا ) کە لە بەیتی دووایی‌دایە لە سەر ئەم بەیتەیە لە واتادا .

دیی بـە خودی خۆی : ( تـەن‌و گیان )و هــەر فەرموودەیەك باسی ڕووداوێکی تایبەت لەمانە دەکاو دژایەتییان لە ناوەندا نیــەو هــەموویــان ڕاســتن •

مەولەویی لێرەدا ئەم بەیتەی پێسارانیی :

**شەوەن خەلوەتەن ماڵ بێ ئەغیارەن**
**ئالەم گرد وتەن دۆس خەبەر دارەن(١٣٠)**

بیر ئەکەوێتەوەو لەوانەشە لە کاتی تەنیاییی‌و ئارامیی شەودا ، زۆریی وتبێتەوە بەڵگەش ئەوەیە هەر وکو خۆیی‌و بێ دەست کاریی لـە دیوانەکەیدا ناواخنی چامەیەکی کردووە ، بەڵێ وا لێرەشدا هەمان بەیت لـە دوو بەتیداو لەگەڵ دەست کاریی‌و لێ زیاد کرنێکی ئێجگار پەسەندو وەرگێڕانیدا بۆ شێوەی سۆرانیی ناواخن ئەکاتەوەو ئەڵێ :ــ

**( لیلا ) شەو خەلوەت بـەینی یارانــە**
**جێی ڕازو نییــــاز دەردە دارانــــە(١٣١)**

**فرصەت غەنیمەت ماڵ بێ ئەغیارە**
**عالەم نووستگە ، دۆســت خـەبەر دارە(١٣٢)**

---

(١٣٠) شەوەن : شەوە ، خەلوەتەن : خەڵوەتە • بێ ئەغیارەن : بێ بێگانەیە • ئالەم : عالەم ، جیهان • وتەن : نووستووە • دۆس : مەبەستی خــــودایە • سەیری دیوانی مەولەویی کە • مــــەلا عبدالکریمی مدرس / (٧١) •

(١٣١) خەلوەت : جێی دانیشتنی نهێنیی • ڕازو نییاز : سەر گوزە شتە گێڕانەوەو نییــاز دەر برِیین • دەردە داران : ئــەوانەی دەردی خۆشەوستییان تووش بووە •

(١٣٢) فرصەت ( فرصة ) : هەل • غەنیمەت ( غنيمة ) : ماڵی تالانیی،

مەبەستی مەولەوی‌ی لە دۆست وەك بێسارانی‌ی هەر خودایە ، لەبەر ئەوە لێرەدا چاك جێگەی خۆی گرتووەو ڕەنگە لە شوێنەکانی تردا تەنانەت بێسارانی‌ی خۆیشی وای بەکار نەهێنابێ .

بەڵێ شەو کاتی خەڵوەتی ناوەندی یاران‌و خۆشەویستانەو سەردەمی بەسەرهات گێڕانەوەو نیاز دەربڕینی ئەوینداران، هەڵێکەو هەڵکەوتووە ، ماڵ لە بێگانە بەدەرەو چۆڵە ، هەموو جیهان نووستووە تەنها دۆست خەبەردارە .

نەك ڕۆژ ظیلال بەم لا ، یا بەو لادا وێ
یا ژێر پێ لە وەخت ئیستیوادا وێ(١٣٣)

بەڵێ لە شەودا ڕووی‌دا نەك لە ڕۆژدا کە سێبەر بە لای ڕۆژ هەڵاتدا یا ڕۆژ ئاوادا یا لە ناوەندا لە نێوە ڕۆدا بێ ؛ چونکە هیچ نەبێ سێبەرەکە ئەبێ بە لایەنی سێهەم‌و خەڵوەتەکە ئەشێوێنێ ،

پاش بەگژا چوونی باوەڕە نا پەسەندەکان‌و شەل‌و پەتکردنی هەموویان ، مەولەوی‌ی ئەیەوێ جارێکی‌تر دەم لە مەسەلەکە بداتەوەو چارە سەرێکی تری‌ی لەسەر دارماڵێکی ئیسلامی‌ی‌و بۆ هەڵوەشاندنی بیرو ڕای کۆمەڵە ئیسلامیە سەر لێشێواوەکان بکات‌و ئەڵێ :

---

دەست کەوتی جەنگ ، هەل . ئەغیار ( أغيار ) : کۆی غەیرە ( غير ) : بێگانە . نووستگە : نووستووە . دۆست : خۆشەویست مەبەست خودایە .

(١٣٣) نەك ڕۆژ : بەرانبەری ( لیلا )ە لە بەیتی پێشووتردا . ظیلل ( ظل ) : سێبەر . ئیستیوا ( استواء ) : یەکسانی‌ی دووبەشی‌ی ڕۆژ ، نیوەڕۆ .

وەك مەولید شەوبوو عوروجی یەقیین
( صـــار رحمـــة علی العـــالمین )(١٣٤)

بـۆ ژێر زەمیینو ئەفـلاکی بـەرِیین
ئوللەی ئەووەلیین ئوللـەی ئاخیریین(١٣٥)

( مـــن المســـجد الحـرام الانفس
الی المســـجد الاقصـــی المقـــدس )(١٣٦)

•

تا ئەگرە قەطعیو نەصصی کیتـابە
ئینکـاری کفـــرە داییـــم عـــەذابە(١٣٧)

---

(١٣٤) عورووج ( عروج ) : بـەرز بوونەوە • یـەقیین ( یقین ) : بێ گومان صار رحمة علی العالمین : بوو بە رەحمەتو بەزەیی بۆ هەموو جیهانەکان •

(١٣٥) بۆ ژێر زەمیین و بەستەیە بە ( صار رحمة )ەوە واتە بوو بـە رەحمەت بۆ ژێر زەویی • ئـەفلاك ( افـلاك ) : کۆی فەلـەکە ( فلك ) : ئاسـمان • بـەرِیین : فراوان • ئوللـەی ئەولیین : کۆمەڵانی پێش لـە پێغەمەر • ئوللەی ئاخیریین : کۆمـەڵانی دوا پێغەمەر •

(١٣٦) من المسجد الحرام الأنفس : لە مزگەوتی حەرامی زۆر بە نرخ لە مەککە • الی المسجد الأقصی المقدس : بۆ مزگەوتی ئەقصای پییرۆز لە قودس •

(١٣٧) ئەگـرە : ئێرە ، مەبـەستی مزگەوتی ئەقصـایە • قـەطعیی ( قطعی ) : بێ گومان • نەصصی کیتابە : دەقی قورئانە : ( سبحان الذي اسری بعبده لیلا من المسجد الحرام الی المسجد الاقصی ••• )

( منـــــه للســـما ومنـــــه الى
مـا شـاءه الله مـن حلـى العلـى )(١٣٨)

ثابت بـه خەبەر مەشهوورەو ئاحـاد
( ترتیبا ) ئینكار بیدعـەتەو فەســاد(١٣٩)

وەكو لە دایك بوونی بەرز بوونەوەشی هەر بە شەو بوو :ـ بوو بە مایەی بەزەیی بۆ هـەموو جیهانـەكان ، بۆ ژیر زەوی ، بۆ ئاسـمانە فراوانەكان ، بۆ كۆمەڵی پێش كەوتوان لـە خـۆی ، بۆ كۆمەڵـی دوا كەوتووانیش

لـە مزگەوتی حەرامەوە لە مەككە تا مزگەوتی ئەقصا لـە قودس چەسپاوە بە دەقی قورئانو نەسەلماندنی كفرەو هۆی سزای هەمیشەییە ٠

لەوێوە بۆ ئاسمان بە فەرموودەی بەناو بانگ : ( الحدیث المشهور ) سـەپاوەو نوكوولیو لیی بیدعەتەو لـەوێوە بۆ بارەگای باڵای خـودا بـە فەرموودەی یەكی : (الآحاد) سەلماوەو لارەملیی لیی خراپیی ئاینە ٠

لێرەدا مەسـەلەكە تـەواو ڕوون بووەوەو ئیتر سـەرەی جـۆرە لێدووانێكی ترە كە شیعرو عیرفان تێدا یەك ئەگـرنو ئـەم پارچە ئێجگار ناسكو وردو ڕەوانە پێك دێنن :ـ

---

(١٣٨) منە : لە مزگەوتی ئەقصاوە ، بەستراوە بە وشەی ( ثابت ) لە بەبیتی دواییدا ٠ من حلى العلى : لە جوانكارییە بەرزو باڵاكان ٠

(١٣٩) ثابت : چەسپاو ٠ خەبـەر ( خبر ) : فەرموودەی پێغەمبەر ٠ مەشهوور ( مشهور ) : ئەوەیە كۆمەڵێكی زۆر گێڕابیانەتەوە ، ئاحاد ( آحاد ) : فەرموودەیەك لە ڕێیەكەوە گێڕابێتەوە ٠ ( ترتیبا ) : بەڕیز واتە مەشهوور بۆ قۆناخی یەكەمەو ئاحاد بۆ قۆناخی دووەم بیدعەت ( بدعـة ) : ئەوەی لـە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەرا نەبێ ٠ لێرەدا پێچانەوەو كرانەوە ( اللف والنشر )یەكی ئاشكرا هەیە ، كە لەڕاڤەكەدا بەكراوەیی باسەكەمان هێناوە ٠

لاده لە ڕێگەی بیدعەتو مونکەر
بڕۆ سەیری سەیر سەییدی سەروەر(١٤٠)

بارەی ناسووتیی لە مەیدان ئاوورد
حەی کردو نەی کرد ، پەی کردو طەی کرد(١٤١)

نە گەرمیی سەمووم لە نزیکەی ئەو ڕەوت
دای لە جوبرەئیل ( لو دنوت ) ئەوت(١٤٢)

پێی ناسووتیی سووت لەبەر بووییی هات
( هات الکؤوس ) لاهووت بەلای هات(١٤٣)

---

(١٤٠) مونکەر ( منکر ) : ئەوەی موسولمانانی پێشوو لەدژی بوون
سەیر : هیی یەکەم کوردییە واتە تەماشا هیی دووەم عەرەبییە
( سیر ) واتە ڕۆیشتن ، دیارە جیناسیان تەناوەندایە · سەیید
( سید ) : گەورە · سەروەر : گەورە ·

(١٤١) بارە : بار بەر مەبەست بوراقە · ناسووتیی : سەر بەناسووت :
جیهانی ماددە ، دژی مەلەکووتیی‌و لاهووتیییە · حەی کر : هەیی‌ی
لێ کرد ، بۆ ئەوەی بییخاتە ڕەوت · نەی کرد : نە ڕۆیشت ·
پەی کرد : پێی لێدا ، یا بە زۆر پێی کرد ، لەم بارەدا باش وایە
( پێی کرد ) بنووسرێ · طەی کرد : ماوەکەی بڕیی ·

(١٤٢) سەمووم ( سموم ) : بای گەرم · ئەو ڕەوت : ڕەوتی بوراق ·
( لو دنوت ) هێمایە بۆ فەرموودەی جوبرەئیل لە کاتی کەوتنییدا :
( لو دنوت انملة لأحترقت ) واتە ئەگەر بەقەد سەرپەنجەیەك نزییك
بوومایەتەوە ئەسووتام ·

(١٤٣) پێی ناسووتیی سووت : پێی بوراق سووتا · مەلەکووتیی :
جوبرەئیل · **مات : بێ دەنگ وچرکە** · ( هات الکؤوس ) پیالە
کان بێنە چونکە دەمیی نۆشینی شەرابی عیرفانی خودا هاتووە ·
لاهووت : خودا · ئەلای هات : بەقەدەمی قوربی مەعنەویی لێی
نزیك بووەوە · جۆرێکی تایبەتە لە نزییك بوونەوە زمان توانای
دەرخستنیی **تەواویی** نییە ·

**هـەر چـەند کە قەدەم قوربەتی دەنا**
**لەو نەوای : ( أدن ) ، لەم ( ثم دنا ٠٠٠(١٤٤)**

**فتدلی ) تا لاچـــوو پێیو قـــەدەم**
**حودووث بە ئەدەب هاتە پێی قیدەم ٠٠٠(١٤٥)**

**( فکـــان قـــاب قوســـین او أدنی )**
**دابەین ئیمکانو وجووبی ئەسـنا ٠٠٠(١٤٦)**
**فأوحـــی الی عبـــدە مـــا اوحـــی**
**وفـــاح مـــا فـــاح علیـــه نوحـــا ) ٠٠٠(١٤٧)**

لـــە ڕێدەی بیدعەتو مونکەر کە نکوولی لـە بەرز بوونەوەی بۆ

---

(١٢٤) قەدەم قوربەتی دەنا : پێی نزیبك بوونەوەی ئەنا ، نەم : لە خودا نەوا : بانگ ٠ أدن : نزیبك بەرەوە ٠ لەو : لە پێغەمەر ٠ ثم دنا : لە پاشا نزیبك بووەوە ، لە نێوان : ( دەنا )ی کوردی و ( دنا )ی عەرەبییدا جیناس هەیە ٠

(١٤٥) فتدلی : هەڵواسرا ٠ تا لاچوو پێیو قەدەم : پێویست بە پێ نەما ٠ حودووث بە ئەدەب هـاتە پێی قیدەم : تازە پـەیدا بوون : ( بۆ پێغەمەر ) بە ڕێزەوە هاتە لای کۆنیی ( بۆ خودا ) ، لەم بەیتەیشا جیناس هەیە : ( قدم ، قدم ) ٠

(١٤٦) ( فکان قاب قوسین او أدنی ) : ئەندازەی دوو کەوان یا نزیکتر بوون ، کینایە یە لە زۆرنزیبکیی لە بارەگای خودا ٠ ما بەین ٠٠٠ تاد : بە ستەیە بە ( کان ) لە مەسرەعی پێشوودا واتە : نەوەندی شیاویو پێویستیی لە هەموو شتڕووناکتر ٠

(١٤٧) فاوحی الی ٠٠٠٠ : لەم کاتەدا خودا بۆ بەندەی خۆی نیگا کرد ئەوەی کردی ، کە ئاشکرایە چییە ؟
فاح ما ٠٠٠٠ : بە زۆریی بۆنی خۆشی بە سەردا بلاو کردەوە ٠

ئاسمان‌و بارەگای خودا ئەکەن لادەو وەرە سەر ڕێگەی ڕاستی سوننەت‌و لەێوە سەیری شەوڕەوی‌ی گەورەی سەروەر کە ◆ بارەی ناسـووتی‌ی (بوراق) هێنایە مەیدن‌و هەیی‌ی لێ کرد ، بەڵام نەی کـردو نەڕۆیشـت ئەنجا پێی لێداو ماوەکەی پێ بڕی‌ی‌و لەکاتی ڕۆیشـتنا گڕەی ڕەوتەکەی دای لە جوبرەئیل‌و پەرێشانی کردو کەوت‌و ئەی‌فەرموو : ئەگەر لـەوە پتر هێندەی سەر پەنجەیەك نزیك بوومایەتەوە ئەسووتام ◆

پێی بوراق سـووتـاو جوبرەئیلیش مات‌و بێ چرکـە بوو ، ئیتر سەردەمی پیاڵەو مەیە ، ئـەوا لاهووت لـە نزیك بوونـەوەدایـە بۆ لای ناسووت ، بەڵێ لاهووت قەدەمی قوربەتی ئەناو هاواری : نزیك بەرەوەی لـە ناسووت ئەکرد ، ئەمیش لە نزیك بوونەوەدا بوو تـا لاهووت خۆی بۆ شۆڕ کردەوەو ئیتر پێ لـە کار کـەوت‌و پەیدابوون : (حدوث) ، بـە ڕێزەوە هاتە لای(١٤٨) بوونی ئەزەلی‌ی : (قِدَم)‌و ناوەندی شـیاوی‌ی‌و پێویستی‌ی هەردوو رووناك ( الامكان والوجوب الأسنى ) ئـەنـدازەی دوو کەوان بوو یانزیکتر ◆

لەو کاتەدا نیگای کرد بۆ بەندەی خۆی ئەوەی کە ویستی‌ی‌و بۆن‌و بەرامەی خۆشی بەسەردا بڵاو کردەوە ◆

ئەنجا دەست بـە باسی باری پێغەمەرو دەورو بەری کاتی بەیـەك گەیشتن‌و وەرگرتنی نیگا ئەکات‌و ئەڵێ :

---

(١٤٨) لێرەدا مەولەووی‌ی لەبەر بەجێ هێنانی ڕێز ، قیدەم‌و وحودووث‌و ئیمکان‌و وجوب بەکاردێنی لـە باتی قەدیم‌و حـادیث‌و مومکین‌و واجیب ، ئێمەش نەمان ویست بی‌ی گۆڕین لەبەر هەمان هۆ ، هەر چەند مەبەست یەکە ◆

**فەلەك پڕ مەلەك سیدرە غەوغابوو**
**( ما زاغ البصر وما طغى ) بوو(١٤٩)**
**ویسعەتی مەشرەب ناموتەناهی‌ی**
**هیچ لە ئاگاهی‌ی نەی دەکرد لاهی‌ی(١٥٠)**

ئاسمان پڕ فریشتەو لەسیدرەتولموتتەها هەراو زەنا بوو ، بەمیش نەگەڵ ئەوەدا چاوی‌ی بڕیبووە حەقو لیی کەلا نە ئەکرد

فراوانی‌ی شوێن خواردنەوەی شیلەی ڕاستی‌ی بێ‌پایان‌بوو هیچ شتێ لە هۆشیاری‌ی نەی ئەخلەفاند ( نە زۆری‌ی فریشتەو نە هەراو زەنایان ) ، لێرەدا مەولەوی‌ی ناواخنی مەسەلەی چۆنیتی نیگاو بینینی خودا بە شێوەیەکی ، تێجکار دیاری‌ی کراوو پتر لە پێویست ئەکاو ئەڵێ :

**ئومووری قودسی‌ی لە دڵ دەدەن سەر**
**( ثم تنتقل منه للبصر )(١٥١)**

---

(١٤٩) مەلەك : فریشتە · سیدرە : ( سدرة المنتهى ) ، درەختێکە لە خوارووی عەرشەوە · غەوغا ( غوغاء ) : دەنکە دەنك ·
( ما زاغ البصر وما طغى ) چاو ئەم لاو ئەو لای نە ئەکردو بە سەرییدا نە ئەڕۆی ·

(١٥٠) ویسعەت : (وسعة) فراوانی‌ی · مەشرەب (مشرب) : خواردنەوە ، شوێن خواردنەوە · لاهی‌ی ( لاهی ) : لە لەهوە ( لهو ) وەوەرگیراوە : خۆ خلافێنەر ·

(١٥١) ئومووری قودسی‌ی : شتی خاوێن لە مایە ( مادة ) ، ئەو شتانەی لە بارەگای خوداوە ئاراستەی پێغەمەر ئەکرێن · لە دڵ دەدەن سەر : لە پێشدا ئەچنە ناو دڵەوە · ( ثم تنتقل منه للبصر ) لە پاشا ئەچن بۆچاو ، واتە ئەوشتە با لەوانەش بێ ببینرێ دڵ یەکەم جار ئەی ناسێ ئەنجا چاو ئەی بینێ مەبەستی بینینی خودایە کەچۆن ڕوویدا ؟

**بل لسائر الحس والقـوی**

**بل لعالم الخلق والسوی )(١٥٢)**

شتەکانی سەر بـە بارەگای قودس‌و بێخەوشیی یەکەم جار سـەر لـە دڵ ئەدەن‌و لەوێوە بەرەو چاو دێن بـەڵکو هەر لەوێشەوە بـەرەو هەستـەکانی تروو هـەموو هێزە زانـەرەکان بەڵـکو بۆ جیهانی مایـەو هەموو شتیی جگە لـە خوداش سەر ئەکێشن ٠ وەکو وتمان مەولەویی لـەم مەسەلەدا گـەلێ زیادە ڕەوی کـردووەو خۆشیی هـەستیی بەوەکردووە بۆیە ئەیەوێ لـە سەپاندنی ئەم ڕا تایبەتییە پاش گەز بێتەوەو بەم شێوە ناسکە ئەڵێ :

**بـە هەر وەجهێ دڵ عیرفانی پێ بوو**

**بـەو ڕوو بـەو بەصەر ڕوئیەتی دای ڕوو(١٥٣)**

---

(١٥٢) بل لسائر الحس والقوی : بەڵکو هەر لە دڵەوەیە ئەچێ بۆ چوار هەستەکەی ترو هێزە نهێنییە دەرك کەرەکانیش وەك : ( خەیال ، حافظة ، وەهم ، ٠٠٠ ) ٠ بل لعالم الخلق والسوی : بەڵکو بۆ جیهانی مایەو هەموو شتیی جگە لە خودا ٠ ئەم چۆنێتییەی مەولەویی باسی دەکات گەلێ تەمو مژاوییەو دوورەو لە تێگەیشتن ، دوور نییە هەر لەبەر ئەمەش لێی پاشگەز بووبێتەوە ٠

(١٥٣) بە هەر وجهێ بوو : هەر چۆن بوو ، لە دڵەوە بوو لە پێشدا یا وا نەبوو واتە : چۆنێتییەکە گرنگ نییە ، ئەوەی گرنگ بێ ئەوەیە کە ٠٠٠ هد٠ عیرفان(عرفان): ناسیین٠ بەصەر (بصر): چاو٠ ڕوئیەتی: بیینیینیی ، ڕاناوەکە بۆ خودایە یا بو پێغەمەر واتە بیینیینی خودا لە لایەن پێغەمەرەوە یا بیینییتی پێغەمەر بۆ خووا ، ئەتوانرێ ( ڕوئیەتێ )یش بخوێندرێتەوە واتە جۆرە بیینیینێك ، هەر چۆن بێ ٠ دای ڕوو : ڕووی دا ، هاتە کایەوە ٠

**بـەصییرەت ناسیی بەصارەت بیینیی**

**دڵ بێنی درۆی نـــەیدا لـــە بێنیی(١٥٤)**

ئەوەی کە گوترا گوایە : بینینەکە لـە دڵەوە بۆسەر ئەچێ مـەرج سیەو ئەوەی گرنگ بێ ئەوەیە دڵ ناسیی‌و بـە چاوی سەریی خـودای بینیی •

بەڵێ هێزی ناسینی دڵ ناسیی‌و هێزی بینی چاو بینیی‌و ڕووداوەکە هێندە ڕوون‌و ئاشکرا بوو ، هەرگیز بۆنی بەدرۆخستنەوەی نەئەهاتە لووتی دڵ‌و بە تەواویی دانی بەوەدا ئەنا کە بینراوو ناسراوەکەی یەکە : ( ما کذب الفؤاد ما رأى ) • لێرەدا مەولەویی ئەیەوێ ، ڕووداوەکانی بـەرز بوونەوە لە دوو بەیتدا کۆ کاتەوەو دڵگیرترین ڕەوانبێژیی‌و کورت ترین شێوەو جـوانترین‌و درێژەدارتریـن پێچانـەوەو کردنـەوەی ڕیزکراو ( اللف والنشر المرتب )ی تێدا بەکار بێنێ‌و ئەڵێ :

**ڕێی چەند هەزار ساڵ ، طەی چەند حیجابات**

**ذاتی حەق ، کـەلام ، سـوئال ، جـەوابات(١٥٥)**

---

(١٥٤) بـەصییرەت ( بصـیرة ) : هێـزی ناسیینی دڵ • بـەصارەت ( بصارة ) : هێزی بیینیینی چاو • بێنی : یەکەم بۆنی ، دووەم لووتی ، لە ناوەندی ئەم دوو وشەو ( بینی )دا جیناس هەیە • مەسرەعی دووەم هێمایە بۆ ئایەتی ( ما کذب الفؤاد ما رأى ) واتە دڵی پێغەمبەر ئەوەی چاوی دیی بە درۆ نەخستەوە •

(١٥٥) طەی ( طي )پێچانەوە • حیجابات ( حجابات ) : کۆی حیجـابە (حجاب) : پەردە ، لە هەندێ فەرموودەدا بە حەفتا هەزار دانراوون‌و دییارە کەمێکییشیان لائەدرێن •

## چوو ، بوو ، دیی ، بییستیی ، گریا ، دریاوه
## هـــاتەوە حەلقـــە هـــەر دەلـەریاوە(١٥٦)

بەڵێ بۆ ڕێی چەند هەزار ساڵ چووو ماوەکـەی بڕیی و ، چـەند پەردەی ناوەند پێچرایەوەو زاتی حەقی دیی و کەلامی ئەوی بیســتو پرسیار کراو وەڵام درایەوەو ئەم هەموو کەینەو بەینە ڕوویدا لە کاتێکی ئەوەندە کەمدا کـە هاتەوە ئەڵقـەی دەرگای ژوورەکەی هێشتا هـەر دەلەرایەوە بەڵێ وەکو ئەی گێڕنەوە جێگاکەشیی هەر گەرم بوو •

خوێندەوەی تیووری نیسبیی یارمەتی تێگەیشتنی ئەم مەسەلە دەدات چونکە کشانو هاتنەوەیەکی کات بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەسەلمێنێ ، جگە لەوەش ئەم جۆرە کارانە هیی خودایـەو لە ڕەوشـتی گـەردوون بەدەرە ، دانانی یاسای سروشت بەم شێوە ئاساییە ئـەوە ناگەیێنێ کـە لـە ماوەیەکی کەم و تایبەتدا ناتوانرێ هەڵگیرێ و جۆرە یاسایەکی تریی لـە شوێندادانرێ •

هەموو داهێنانێك لـە هەر سەردەمێکا بێتە کایەوە هەندێ پرسیار بەرپـا ئەکات و لق و بۆپی هەندێ بیرو باوەڕیش ئەکات ، بە کورتیی تینێکی ئاشکرای بۆ سەر بیری ئەو سەردەمە دەبێ •

---

(١٥٦) چـوو : ئـەگەڕێتەوە بۆ ( ڕێی چەند هەزار ســاڵ ) • بوو : ئەگەڕێتەوە بۆ ( طەی چەند حیجابات ) • دیی : ئەگەڕێتەوە بۆ ( ذاتی حەق ) • بییستیی : دەگەڕێتەوە بۆ ( کەلام ) • کریا : ئەگەڕێتەوە بۆ (سوئال ) • دریاوە : ئەگەڕێتەوە بۆ ( جەوابات ) ، ئـەم پێچـــانەوەو کـــردنەوە ڕیزکراوە ( اللف والنشر المرتب ) **ڕەوانبێژییەکی تێجگار سەر سوڕهێنەرو کورتییەکی زۆر بێ وێنەی** تێدایە ، یەکەم جارە تووشیی دوازدە شتبم بەم جۆرە دلگیرە پێچانەوەو کردنەوەی ڕیزداریان لە نێواندا دروست کرابێ •

دیاره له سەردەمی مەولەویدا تەلگراف داهێنراوەو دەنگ‌و باسی بڵاو بووەتەوەو لەوانەشە مەولەوی‌ی خۆی‌و کەسانی‌ناوچەکەش دیبێتیان‌و برێ لەوانییش بەرزبوونەوەیان بەم جۆرە شتانە داوەتە قەڵەم کە لە یاساو نەریتی سروشت دەر ناچن ، مەولەویش خۆی ئاسا ئەم دوو بەیتەیان بە شێوەی گاڵتەو گەپ ئەدا بەناوقەداو ئەڵێ :ـ

**هەی تەل ! هەی نەی کەی • پێی گەی ؟ هەی نەی خۆی •**
**وەك ماری زامدار هەر پێچدا لە خۆی(١٥٧)**

**فەرقییان هەی فام ئەهلی زەمانە !**
**هەر لە سەر زەمین هەتا ئاسمانە(١٥٨)**

---

(١٥٧) هەی تەل : ئەی تەلگراف

هەی نەی کەی : ئەم ڕستە بۆ دەربڕینی بێ دەسەڵاتی‌ی یەکێك بۆ شتێ بەکار دێنرێ کە خۆی وا بزانێ یا وا دەربڕێ کە کارێکی ئاسانە بۆی ، لە شێوەی گاڵتەدا بەکار دێنرێ •

پێی گەی ؟ : بۆ پرسیاری نوکولییە ، واتە : ئەتەوێ پێی گەی ؟

هەی نەی خۆی : بۆ نەهاتنە دی‌ی ئاواتی یەکێ بۆ شتێك کە وا بزانێ یا وا دەربڕێ کەپێی ئەگات بەکار دێنرێ ، مەبەست هەر خواردنی ڕووت نییە •

وەك ماری زامدار پێچ دا لە خۆی : با تەلگراف هەر وەکو ماری برینیدار پێچدا لە خۆی ، هەر ناتوانێ بە خاوەنی میعراج بگات • لەوە ئەچێ مەولەوی‌ی بیستبێتی یا دیبێتی کە وایەری تەلگراف پێچ بێچە وەك وایەری سەمماعەی تەلەفوون ، دیارە لێچوانەکەش لەم بارەدا زۆر جوان‌و بەجێیە •

(١٥٨) فەرقییان : جیاوازییان واتە جیاوازی‌ی تەلگراف‌و موعجیزەی میعراج • وا دیارە خەڵك تانوتیان لە میعراج دابێ بەوەی کە تەلگراف هیچ موعجیزەیەکی تێدا نییەو زادەی زانیاری‌ی‌و پیشە

هەی تەل ! ئا بەم جۆرە بانگ کردنە[١٥٩] هەی نەی کەی ! خۆت خڕ هەڵمەدەو هەوڵی بەر بەرەکانێ مەدە ، ئەوە بۆ تۆ نەهاتووە ، ئەتەوێ پێی گەی ؟! ( بە پێغەممەر یا بوراق ، یا میعراج ) هەی نەی خۆی ! ئەوە لەوەڕی تۆ نیە • ئینجا ئاووڕێك ئەداتەوە بەلای هاو چەرخەکانی خۆیداو ئەڵێ :

با تەلگراف وەك ماری برینداد هەر خۆی پێچداو پترئازاری خۆی بەسۆتر کا جگە لە بەزین و پەشیمانیی پتر هیچی‌تر بە دەست ناهێنێ • تۆش ئەی تێگەیشتنی خەڵکی هاو چەرخ هیچی‌تر لەمە گومڕاو ، لە خۆت بایی مەبەو تێگە ، جیاوازیی ئەم دووشتە وەکو ماوەی ناوەندی سەر زەویی و ئاسمانەو ئیتربەراوورد کردنیان کارێکی زیرانە نیەو نۆزێ شەرم بت گرێ •

لەپاشا مەولەوی ئەیەوێ ئەنجامێکی ئەم ڕووداوە گرنگە بخاتە ڕوو بە شێوەیەکی شیعریی سۆفیگەریی ناسك و گەلێ پەسەندو دلگرو ئەیشیەوێ بیکا بە گۆتاییی باسەکە لەبەر ئەوە ئەڵێ :ــ

---

سازییە لە میعراج گرنك ترە چونکە ئەبێتە هۆی بە یەك گەیشتن لە ماوەی زۆر دوورەوە •

هەی فام ئەهلی زەمانە ڕستەی بانگ کردنە واتە ئەی تێگەیشتنیی خەڵکی سەردەم ، دوان لەگەڵ تێگەیشتندا لەبەر ئەوەیە ئەو هۆی بەهەڵەدا چوونەکەیانە • هەر لەسەر زەمیین هەتا ئاسمانە : واتە جیاوازیی تەلگراف و میعراج وەك جیاوازیی زەویی و ئاسمان وایە چونکە تەلگراف دەنگێکی ڕووت بۆ ماوەیەکی کەم دەگوێزێتەوەو توانای پەیوەندیی لەگەڵ ئاسماندا نییە بەلام میعراج بەتەن بووە بۆ ئاسمانییش و لە ماوەیەکی زۆر کورتییشدا •

(١٥٩) وشەی ( هەی ) بۆ بانگ کردن لە کاتی بە کەم گرتنی بانگ کراوەکەدا بەکار دێنرێ •

پەردەی ظوڵمانیی نەفسانیی لاچــوو
تۆمی وەردی عیلم عیرفان سێراو بوو(١٦٣)

خەندەی غونچەی کەشف کەونیی و ئیلاهیی
ســـەوزەی کـــەرمات نا موتــەناهیی(١٦٤)

هەر یەك بە طەرزێ خۆی نومایش دا
باغچـــەی ئەولیـــای پێ ئارایش دا(١٦٥)

ڕووناکیی ئەو مانگی چواردەیە لەو دەورو بەرەدا ئەو شەوە ، دای بــە دەشتی دڵی گشت پاڵاوتەکانی خوداداو ئایەتی : ( واشــرقت الأرض بنور ربّها ) تەئویل کرا بــە هەڵهاتنی مانگی ڕاستیی بەسەر دڵی ئــەو هەڵبژاردانەداو ڕووناك بوونەوەی بە نیشــکی پەروەرگاری خــۆیــان ،

---

لێکدانەوەیەکی سۆفییگەریی ڕووتە لــەبــەر ئەوە پێوستە واتای دیمەنیشی بگیبرێتەدڵ ٠
تــەفسییر ( تفسـیر ) لێکـدانەوەی قـورئان بــە پێی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمەر ٠

(١٦٣) پەردەی ظوڵمانیی نەفسانیی لاچوو : پەردەی تاریکی نەفسی بەد خوو لاچوو ٠ تۆم : تۆو ٠ سێراو بوو : تێراو بوو ، لــە چــاپی خەتەکەیشدا ( سراوبو ) نووسراوە بــەڵام لەبــەر ئەوەی سەراو بوون بۆ پووچەڵەو ئەمەیش دژیی مەبەست ئەگەیێنێ وامان دانا ٠
(١٦٤) کەونیی ( کونی ) : جیهانیی ، واتــە شارەزاییی جیهانی مایــە ( مادده ) ٠ ئیلاهیی ( الهي ) : خوداییی ، کەشفی ئیلاهیی واتە شارەزاییی جیهانی ڕەوان و فریشتەو پرتەوی ڕووناکیی خودا ٠ نا موتەناهیی : بێ کۆتاییی ٠
(١٦٥) خۆی نومایش دا : خۆی نواند ، دەرخست ٠ پێ ئارایش دا : پێ ڕازاندەوە ٠

**شووڵەی ئەو بەدرە لەو دەورە ئــەو شەو**
**شەونم لەو هەورە بەو طەورە ئەو شەو(١٦٠)**

**دا وە دەشتی دڵ گشــت ئەصــفیادا**
**وەشت وە کیشتی سیرڕ گشــت ئــەولیادا(١٦١)**

**( اشــرقت الارض ) تەئویيــــل دریــاوە**
**( مأة حبه ) تەفســـــیير کـــریاوە ٠(١٦٢)**

---

(١٦٠) شووڵە (شعلة) : ڕووناکی، بەشی ڕووناکی گڕ ٠ ئەوبەدرە : ئەو مانگی چواردەیە ، مەبەست پێغەممەرە (د٠خ) ٠ شەونم لەو هەورە : شەونمی هەوری عیرفانو خوداناسیی ٠ بەو طەورە : بەو شێوە ٠

(١٦١) وەشت : باراندیی ٠ کیشت : کشتو کاڵ ٠ سیرڕ : نهێنیی ، مەبەست شــوێنێکە لــە دڵدا هەوارگەی فیووضــاتو ڕووناکیی خودایە ٠

(١٦٢) ( اشرقت الارض ) هێمایە بۆ ئایەتی : (٦٩) لە سوورەتی زومەر ، من وای بۆ ئەچم ئەو تەئویيلەی مەولەویی مەبەستییە ئەوەیە کە مەبەست لە ئەرض ( أرض ) دڵی پالفتەکانی خودایە ، چونکە ئایەتەکە بــۆ ڕۆژی قیيامەت هــاتووە ، زەوییش لــەو کاتەدا بە زەوێتیی نامێنێتەوە ٠ تەئویل ( تأويل ) : لێك دانەوەی ئایەتەکانی قورئان بە بیيرو ڕا ٠

( مأة حبة ) ئیشارەیە بۆ ئایەتی : (٢٦١) لە سوورەتی بەقەرە : ( مثل الذين ينفقون اموالهم في سبيل الله كمثل حبة أنبتت سبع سنابل في كل سنبلة مأة حبة والله يضاعف لمن يشاء ) واتە وێنەی ئەوانەی سامانیان لە ڕێی خودادا خەرج ئەکەن وەك باخچەیەك وایە حەوت گوڵ بروێنێ هەر گوڵێك صەد دانەی تێدا بێو خوایش بۆ ئەوەی ئارەزووی بێ چەندانی ئەکاتەوە ، لەوە ئەچێ ئەو لێکدانەوەی مەولەویی مەبەستی بێ ئەوەیە مەبەست ئەو تۆوی عیلمو عیرفانەیە کە لە سیرڕی خودا ناسەکاندا دەچێنرێ ، خودا پیيتی ئەخاتێ ٠ دیارە ئــەم لێکدانەوەیش لەگــەڵ دییمەنی ئایەتەکەدا نا گونجێو

بەروەی تاریکی نەفسی بەدخوو لاچووو خونچەی دەرکەوتنی نهێنییەکانی جیهانی ناسووت و مەلەکووت و لاهووت دەمی بە زەردەخەنەوە کردووەتەوە •

ئەمە لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە شەونمی هەورێ ناسینی ڕاستەقینەی خودا ئەو شەوە بەسەر کشت و کاڵی نهێنی ( سِّر ) هەموو دۆستەکانی خودادا بەو جۆرە بارێ کە ئایەتی : ( في كل سنبلة مائة حبة والله يضاعف لمن يشاء ) لێکدرایەوەو دەرکەوت مەبەست تۆوی وەردی زانیاری خودا ناسینە تێراو بووە بەو شەونمەو حەوت سەد قات و پتر ئەبڕێ و سەوزەی کەراماتی هەمیشەیی بەردەوام ئەڕوێنێ • ئەو خونچە دەم بەخەندەو ئەو سەوزە بێ پایانە هەر یەکێکیان بە جۆرێ خۆی ئەنواندو باخچەی دۆستەکانی خودای پێ ئەڕازایەوە(١٦٦) •

لێرەشەوە ماوەیەکی زۆر ماڵئاوایی لە مەولەوی دەکەین بەلام : کەرامەت و موعجیزە بدوێ تا هیلاك ئەبێ و لەپاشا لە دۆستانی خوداو چوار یاری پێغەمبەرو هاوەڵ و دوو نەوەکەی و کەسانی تر کە پەیوەندیان بەم باسانەوە هەیەو ، مەسەلەی جێ گری و باسی زاناو پێشەواکانی ئایینی ئیسلام ، کە بە ڕاستی لە هەموو شوێنێکدا مافی

(١٦٦) ئەم ڕاشە لەسەر ئەوەیە لە ( شووڵەی ئەو بەدرە )وە پێنج مەسرەعی یەکەم لە پێنج بەیت بەستراوون بە یەکەوە ، وە هەر وەها پێنج مەسرەعی دووەم • ئەنجا بەیتی شەشەم : ( هەر یەك بە طەرزێ ••• ) بۆ هەموویانەو ئەیان بەستێ بە یەکەوە • هەر چەند ئەم هونەرە ئەتوانرێ لە ژێر پێچانەوەو کردنەوەی ڕیزدردا ( اللف والنشر المرتب ) جێ بکرێتەوە ، بەلام بە ڕاستی هونەرێکی ئێجگار ناسك و جوانەو تا ئێستە لە شیعری کەسی تردا وێنەیم نەدیوە •

خۆیانی داونەتێو بەرز ترین ڕەوانبێژیی‌و قووڵ ترین توێژانەوەی تێدا بەکار هێناون ، بەڵێ ئەم باسانە ئەپێچینەوەو لە باسی پیاوان‌و ڕێگاکانی سۆفیگەرییەوە دەست پێ دەکەین‌و لەویش چەند پەڕ یەك ئەپێچینەوە تا لێ ئەبێتەوە لە باسی شیری هیندی ئیمامی ڕەببانیی‌و بازی خودا شێخ ( عبدالقادر )ی گەیلانیی‌و ئەڵێ :

**با بێینە سێوەر ئەم دوو هوما**
**( رضی الله الهادی عنهما )(١٦٧)**

ئەنجا لێرەوە دەست دەکات بە باسی مەولانا خالیدو شێخ وەسمانی تەوێڵەو چوار کوڕە ڕابەرەکانیی‌و ئەڵێ :

**شوولەی ئەو نیسبەت موجەددیدییە**
**( لمطلعها الف تحیه )(١٦٨)**

---

(١٦٧) سێوەر : سێبەر • هوما : باڵندەیەکی ئەفسانەیییە ناوبانگی بە نگیین‌و فەڕەوە دەر کردووە ، گوایە بە سەر هەر کەسێکە بنیشێتەوە ئەبێ بە پاشا • الهادی : ڕێ نیشاندەر ، مەبەست خودایە ، بەم جۆرە بۆیە ناوی هێناوە لەبەر ڕێکەوتی ڕابەریی ئەم دوو خواناسە کە باشتر ئەبێ بە هۆی بەزەیی خوداو لێ خۆشبوونیان •
عنهما : لە هەر دوو کیان ، لێرەدا مەولەویی ناسکییەکی : ( لطافة ) دلگیری بەکار هێناوە جگە لە جیناسییش ، چونکە ئەگونجێ ( هما ) ڕاناو بێ یا ناوی باڵندەکەبێ ، مەولەویی خۆی لە پەراوێزێکدا هێمای بۆ ئەمە کردووە •

(١٦٨) شوولە ( شعلة ) : بەشیڕووناکی گڕ • ئەو نیسبەت موجەددیدییە : واتە ئەوەی نیسبەت بۆ موجەددید ( مجدد ) :

**بۆ دەفعی ظولمەت لە نزیك و لە دوور**
**سەرەیانی كورد بلوور ئەو بلوور(١٦٩)**
**تا دای لە بلوور ئودنو شنەفتە**
**شارەزای سازای ئەطواری هەفتە(١٧٠)**

---

تازەكەرەوە ، دراوە ، چونكە ئەو شێوازی سۆفییگەریی نوێ كردووەتەوە لە سەدەی دوازدەهەمی كۆچییدا ، مەبەستی شێخ ئەحمەدی فارووقیی سەرهەندییە كە ناوبانگی بە (ئیمامی ڕەببانیی) دەركردووە .
لمطلعها الف تحية : هەزار سڵاو بۆ ئەو شوێنەی ئەو شووڵەی لێ **هەڵهاتووە .**

(١٦٩) دەفع ( دفع ) : پاڵ پێوەنان ، ڕەواندنەوە . سەرەیان ( سریان ) : تەشەنە . بلوور : شووشەی بێگەردو ڕوون .

(١٧٠) بلوور ئودنو شنەفتە : ئەو بلوورەی ئودنوی ( أدن ) بیستووە ئەم دەربڕینە زۆربەی جار بۆ پێغەمبەر بەكار دێنرێ كە لە شەوی میعراجدا خودا پێی فەرموو ( أدن ) ، ( ثم دنی فتدلی فكان قاب قوسین او أدنی ) بەڵام لێرەدا بۆ ئەو دەست نادات كە وا بوو ئەبێ مەبەست مەولانا خالید بێ كە ئەگێڕنەوە شێخ عەبدوڵڵای دیهلەویی هەمان وشەی پێ فەرمووە ، لەم بارەدا هیچ نیشانەیەكی جیاكەرەوە نامێنێ لە نێوان باسی مەولاناو شێخ وەسماندا زۆربەی

بەیتەكان لەوە ئەچن كە هەر بە شێخ وەسماندا گوترابن و باسی مەولانا نەكرابێ كە ئەمەش شتێكی ناڕەوایە ، لەگەڵ ئەوەشدا نەبیستراوە كە شێخ وەسمان ئودنو شنەفتەبێ ، لە دیوانەكەیدا كە هەمان بەیتی بۆ شێخ وەسمان بەكار هێناوە بەم جۆرە هاتووە : خەلیفەی صەدای ئودنو شنەفتە لێرەدا ئودنو شنەفتە پێغەمبەر بێ یا مەولانا بێ هەربۆ شێخ وەسمان دەستئەدا بە هۆی وشەی ( خەلیفە )وە ، دووریش نییە بە هەموو پێگەیشتوویەك بگوترێ

ڕووناکیی‌و جیلوەی ئیمامی ڕەبانیی شێخ ئەحمەدی فارووقــیی سەرهەندیی موجەددیدیی بۆ پـاڵ پێـوە نانی تاریکیی لـە نزیك‌و دووری جیهانی ئیسلامدا تەشەنەی کرد بلووراو بلوور تـا دای لە بلووی مەولانـا خالیدی نەقشبەندیی شارەزووریی کە دەنگی : ئودنوی لـە شێخ عەبدوڵڵای دیهلەوییی بیست‌و شارەزای هەر حەوت طەورەکەیە : ( خاوین کردنی ڕۆح ، خاوێن کردنەوەی دڵ ، سیڕڕ ، خەفیی ، ئەخفاء نەفس ، طەبیعەت ) کە موریید پێیاندا تێ دەپەڕیی‌و ئامادەیە بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات تا ئەیان گـەیێنێتە کەنـاری هێمن‌و دوور لە مەترسـیی دەریای عیرفان‌و خودا ناسیین(١٧١) .

ئەنجا پاش ئەمە مەولەوییی دەست ئەکات بە باسی شێخ ڕەحمان‌و ئـەڵـێ :ـ

---

بەشێوەی ڕەمز ، لەگەڵ ئەمانەشدا من هەر وای بە ڕاست ئەزانم مەبەست مەولانا بێ لە هەردوو شوێنەکەدا ، هەر چەند سنوورو ناوەندییش دیاری نەکراو بێ ، چونکە ئەم‌و مژوو تێکلاو کردن لە ڕێبازی سۆفییگەرییدا ڕەوایە !!!

ئەطواری هەفتــــە : لەپەراوێزی چاپەکەی ( محي‌الدين صـــــبری النعيمی )دا ئەم حەوت طەورەی بەمانە داناوە : (وەرع ، زوهد ، تەوەککول ، جووع ، عەزلەت ، قەناعەت ) بـەلام مامۆستا مـەلا ( عبدالكريم )ی مودەڕڕیس لە پەراوێزی دییوانی مەولەوییدا کـە هەمان بەتیی تێدا دووپات بووەتەوە ، لە نامەیەکدا کە بۆ شێخ وەسمانی نووسییوە بەمانەی داناوە : ( تەصفیەی رۆح ، تەصفییەی دڵ ، سیڕڕ ، خەفی ، ئەخفا ، نەفس ، طەبیعەت ) ، وا ئەزانم ئەم بووچوونەیان گونجاو ترە .

(١٧١) ئەم ڕاڤەو دابەش کردنە لەسەر دواتریین ڕا بوو کە دەرم بڕی لە پەراوێزێکی پێشوودا ، من وای بە جوان دەزانم ، خوێنەرییش ئارەزووی خۆیــە ، لەوانەیە بۆچوونێکی جوانتریی بۆ ڕێکەوێ .

**پیری پاك له گەرد خاكی ناسووتیی**

**مەنزلگەی سەر بەرز سیرڕ مەلەكووتیی(١٧٢)**

**دل بە نەوای بەزم جەبەرووت تاوا**

**سێراوی سەر ئاو لاهووتیی ماوا(١٧٣)**

**لە شەو هەوارگەی فــەنا بگردگ**

**پێی هەردی بەقــا یاتاخگە كردگ(١٧٤)**

**( جســما لدینــا روحــا لدیــه )**

**دائیرەی تــەمام ( منــه الیــه )(١٧٥)**

پیری خاوێن لــە تــەپو تۆزی جیهانــی ئادەمیزاد ، نیشــتە جێی

---

(١٧٢) ناسووتیی : نیسبەتە بۆ ناسووت : جیهانی ئادەمییزاد · سیرڕ : نهێنیی زاراوەیەكی سۆفییكەرییە مەبەست شوێنێكی تایبــەتە لــە دلدا جێی ڕووناكیی خــوداییيە · مەلــەكــوتیی : نیسبەتە بــۆ مەلەكووت : جیهانی وانا ، ڕەوانی فریشتە ·

(١٧٣) جەبەرووت : جیهانی گەورەیی : ( عالم العظمة ) لای (ابو طالب)ی مەككیی ، جیهــــانی ئەسماو سیفاتە ، یا جیهــــانی ناوەڕاســـت لای زۆربەی سۆفییەكان ·

(١٧٤) فەنا ( فنــاء ) : لاچوونی وەسفی نالەبار بــە وەرزشی گیانیی ئەكرێ · بگرگ : تێپەڕییو · بەقا ( بقاء ) : بە دەست هێنانی خوو ڕەوشتی پەسەند یا مەبەست دۆخی ســەرگەرمییە بــە زاتی خواوە بە جۆرێ هەست كردنی بە جیهانی مولك و مەلەكووت تێدا نەمێنێو بەقاش هاتنە سەر خۆیە پاش برینی ئەم پلەیە · یاتاخگە : شوێنی حەواندنەوەو خەوتن ·

(١٧٥) جسما لدینا روحا لدیه : بە لاشە لای ئێمەو بە ڕوان لای ئەو : ( خودا ) دائیرەی تەمام ( منــه الیه ) : بازنەی تەواو لەئەوەوە بۆ ئەو ·

بەرزایی‌ی جیهانی مەلەکووت ، دلشاوا بە ئاوازی بەزمی جەبەرووت ، تێراوی سەراوی جیهانی لاهووت و خواناسی ، لە هەواری شەوی فەنا تێپەڕیو ، لە داوێنی هەردی بەقادا نیشتەجێ ، بە لاشە لای ئێمەو بە ڕەوان لای لاهووت بازنەی تەواو ، لەوەوە بۆئەو ؟ گەیێنەری ، نیازی ئێمە بە ئەوو خۆشنوودی‌ی ئەویش بە ئێمە . ئەنجا هەر لە سەر وەسفی شێخ وەسمان ئەڕواو ئەڵێ :ـ

**چون گوزەگەی بوو مەراتیب هەر پەنج**
**لە گەنجی هەر پەنج بوو بە گەوهەر سەنج(١٧٦)**

**چاو بڕییگەی حوکم ئەمری قەضاوە**
**دڵ بە دەس تەسلیم وەصفی ڕەضاوە(١٧٧)**

**پێ لە دەرەجەی ڕەفییعەی قوبوول**
**وەسییلەی وثقای فەضییلەی وصوول(١٧٨)**

(١٧٦) گوزەرگە : شوێنی ئامۆشۆ کردن . مەراتیب ( مراتب ) : کۆی مەرتەبەیە ( مرتبة ) : پلە ، لە پەراوێزی چاپەکەدا بەمانە دراونەتە ئەڵەم : ( **عالەمی** ذات ، **عالەمی** صیفات ، **عالەمی** ئەرواح ، عالەمی میثال ، **عالەمی خەلقی** ئەجسام ) .
گەنج : **خەزنە** ، **گەوهەر** سەنج : گەوهەر ڕێکخەر ، هونەر .

(١٧٧) چاو بڕییگە : چاوەڕووان . قەضا ( قضاء ) : فەرمانی کشتی‌ی خودا **بە سەر هەموو** بوونەوەرێکدا ، هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد . ڕەضا ( **رضاء** ) : **دڵخۆش** بوون بە ڕوو دانی قەزا .

(١٧٨) دەرەجە (درجة) : پلە ، پەیژە ، ڕەفییعە (رفیعة) : بەرز . وەسییلە ( وسیلة ) : هۆ . وثقا ( وثقی ) : مێی ئەوثەقە ( اوثق ) : زۆر چەسپو نووساو . **فەضییلە** ( فضیلة ) : بەهرە .
وصوول ( **وصول** ) : گەیشتن بە خودا .

چونکه لەم کەینو بەنیەدا بە سەر هەر پێنج پلەکەدا هاتوچۆی ئەکردو لە گەنجی هەر پێنج پلەکە یا هەر پێنج پێمەوا گەورەکە ، بوو بەگەوهەر ڕێکخەر •

چاوی بڕیبوەتە فەرمانی چارە نووسی خوداوەو دڵی خۆشە بە بەجێهێنانی فەرمانەکانییەوە هەر چۆن بن ، وە لەبەر ئەوە پێی ناوەتە پلەی بەرزی وەرگرتنو بووەتە ناوەند (١) زانیسی بەڵگەییو ناسینی شوهودییو هەر زانای پایە بەرزی بەڵگەییە ، شێخ یارمەتیی ئەداو ئەی گەیێنێتە پلەی ناسینی شوهوودیی ( عین الیقین ) •

لێرەوە مەولەویی دەست ئەکا بە هێما کردن بۆ ناوی شێخو لەقەبی، ئەنجا ناوی بە شێوەی موعەمماو لە دواتریشدا دەقاو دەقو ئەڵێ :

**واسیطەی ڕێگەی بە ینی عیامو عەین**
**واریثی حائیز حەیای ( ذی النورین )(١٧٩)**

---

(١٧٦) واسیطة ( **واسطة** ) ناوەند • عیلم ( علم ) : **کورتەی** ( علم الیقین )ە ، **مەبەست زانیینی** بەڵگەییە • **عەین** ( عین ) : کورتەی ( **عین الیقین** )ە ، **مەبەست** ناسیینی خودایە لە ڕێگەی خۆ درخستنەوە • واریث ( وارث ) : میبرات بەر ( حائیز ) ( حائز ) : خاوەن • حەیا ( حیاء ) : شەرم • ذی النورین : خەلیفەی سێهەم عوثمانی **کوڕی عەففان** ، ناوبانگی بە شەرمەوە دەرکردووە، دوو کچی پێغەمەری هێناوە ، بۆیە وای پێی وتراوە ، لێرەدا مەولەوی هێما ئەکات بۆ ناوی لێدوواوەکەی کە شێخ عوثمانی تەوێڵەیە •

(١) لێرەوە لە ڕاستییدا ڕافەی مەسرەعی یەکەمی بەیتی پاشەوەیە ، لە بەر لێك نە پچڕانی دوو مەسرعی بەیتەکە هێنامانە ئێرە •

سیراجی وەهاج شەرعو طەریقەت
سەر مایەی ڕەواج کالآی حەقیقەت(۱۸۰)

( نورە الساری ملأ الکونین
منه استضاء قلب الثقلین )(۱۸۱)

قوطبی زەمانو ضەمانی ئەمان
ئەمانی ئەوان ، ئەوانو ئەمان(۱۸۲)

میرات بەری شەرمی خەلیفەی سێهەم عونمانی کوڕی عەففان کە ناسراوە بە : ( ذي النورين ) ، چرای پڕتەو هاوێژی شەرعو طەریقەت ،

---

(۱۸۰) سیراجی وەهاج : چرای پڕتەو دار ، هێمایە بۆ لەقەبی شێخ وەسمان کە ( سراج‌الدین )ە . شەرع ( شەرع ) : فەرمانە سەرزارەکییەکانی ئایینی ئیسلام . طەریقەت ( طريقة ) : ڕێی سۆفییگەریی بۆ خاوێن کردنەوەی نەفسو ناسینی خودا . ڕەواج برەو . کالآ : کەل‌وپەل . حەقییقەت ( حقيقة ) : ڕاستیی ، مەبەست لێرەدا ئەو بییرو باوەڕەیە کە سۆفیی ئەی گاتێ لە تەرییقەتەوە .

(۱۸۱) نورە الساری ملأ الکونین : ڕووناکیی تەشەنە کردەی ئەو هەر دوو جیهانی پڕ کردووە . منه استضاء قلب الثقلین : لەوەوە ڕووناکیی وەر ئەگرێ جەرگەی مرۆڤو جنۆکە .

(۱۸۲) قوطب ( قطب ) : تەوەر ، خاوەن پایەیەکی تایبەتیی لە دۆستەکانی خودا . ضەمان : ( ضمان ) : لە ئەستۆ گرتن ، مەبەست لێرەدا بە ڕێی مەجاز لە ئەستۆ گرە . ئەمان ( أمان ) : یەکەمو دووەم ، دڵنیایی ، دوورێی لەمەترسیی ، پەنا ، سێهەم کوردییە کۆی ( ئەم )ە مەبەست کۆمەڵی مرۆڤە . ئەوان ( أوان ) یەکەم کات دووەم کوردییە کۆی ( ئەو )ە ، مەبەست کۆمەڵی جنۆکەیە ، چەند جیناسێکی ئاشکرا لە بەیتەکەدا هەیە .

سەر مایەی برەوی کەلوبەلی ڕاستی ی ، ڕووناکیی تەشەنە کردەی ئەو هەر دوو جیهانی ناسووت و مەلەکووتی پڕکردووە ؟ لەوەوە دڵی هەر دوو گرۆی مرۆڤ و جنۆکە ڕووناك بووەتەوە ، تەوەر (قطب)ی سەردەم و زامنی دڵنیایی ی و ، پەنای سەر دەم بۆ مرۆڤ و جنۆکە .

مەولەوی لێرەدا ئەیەوێ کارەکە قووڵتر کاتەوەو لە ڕەمزو هێما زاز بێنێ و بە شێوەی موعەمما ( مُعَمّا ) ناوی شێخ بهێنێ لەبەر ئەوە ئەڵێ :ـ

**حورمەتی نەهێشت کوستاخیی کردن**
**نامی نامیی ئەو بە صەریح بردن(١٨٣)**

**لەو دلی نا جنس ڕەنگێ تر ئاورد**
**( زینده )ی ئەبەد بو تێدا زیاد کرد(١٨٤)**

---

(١٨٣) حورمەت ( حرمة ) : ڕێز . کوستاخیی : بێ شەرمیی . نام : ناو . نامیی : خاوەن شۆرەت . صەرییح ( صریح ) : دەقاو دەق ، بێ پێچو پەنا .

(١٨٤) لەو : لە چاپەکەدا ( ئەو ) بەڵام ئێمە خەتەکەمان بە ڕاست زانیی . نا جنس : نا جسن ، بەد . ئاوود : هاورد ، هێنا . زندە : ( زینده ) ، زیندوو وەکو مەولەویی لە پەراویزێکا ڕوونی کردووەتەوە ئەم بەیتە دوو مەبەستی هەیە یەکەم پیا هەڵدانی شێخ وەك بەیتەکانی تر دووەم موعەمما بە ناوی ( شیخ عثمان ) یەکەم بەم جۆرەیە : چونکە کووپەی پڕ لە فیووضاتی شێخ کە مورییدی پێ ڕەنگ ئەکا بریتییە لە ( صبغة الله ) کە لە بەر بێ ڕەنگیی هەموو ڕەنگێکی لێ پەیدا ئەبێ ، کراسی دلی مورییدی ناجسنی کە لەو ڕەنگە خوداییە دوورە ـ بێ ڕەنگ کردی ڕەنگە نالەبارە کەی خۆی گۆڕا بە ڕەنگێکی ترو ژیانی هەمیشەیی ی دەست کەوت .

دووەمییش بەم جۆرەیە : مەبەست لەدڵ ( قلب )ە بە واتای

ڕێز ناهێڵی له نێوان موریدو شێخا ناوی خاوەن شۆرەتی ئەو دەقاو دەق بردن ، به گوستاخیی‌و بێشەرمییەوە ؟ کە وابوو با بە شێوەی موعەمما ناوی بهێنین : له شێخەوە دڵی موریدی ناجسن‌و ناپەسەند ڕەنگێکی تری هێنا ؟ چونکه له ڕەنگی کووپەکەی خۆی لێدا کە بریتیە لە ڕەنگی خودا (صبغة الله)و نیشانەی بێڕەنگییەو هەموو ڕەنگێ ئەگۆڕێتە سەر ڕەنگی خۆی ، وە بە هۆی ئەم ڕەنگەوە ژیانێکی هەمیشەیی زیاد کراوی داپێ جا ئیتر خۆت تێگە شێخ ئەبێ ناوی چیی بێ ؟!

لەم حاڵەدا جامی نارامی خوینەر لێو ڕێژ ئەبێ‌و ئیتر توانای چاوە ڕوژانیی نامێنێ‌و ئەڵێ : تا کەی تەم‌و مژاوییی‌و بە شێوەی هێماو کوێر کردن دوان ، دەی فەرموو دەقاو دەق ناوی بهێنەو ڕزگارمان کە :ــ

---

هەڵگێڕانەوە ، هەڵگەڕاوەی ( ناجنس ) ( سنجان )ە ، دڵی ناجنس بوو بە سنجان ، وە ئەگەر ئەمییش ڕەنگێکی تر بێنێ‌و بە کرداری ( تصحیف ) نوختەکانی بگۆڕێ ئەبێ بە : ( شێخان ) ، ( زندە )ی ئەبەد واتە بێ کۆتاییی ( زند ) ئەگرێتەوە کە پیتەکانی هەر یەکە خانەیەك بەرزی کەیتەوە وای لێ دێ : ز = ٧٠ ، ن = ٥٠٠ ، د = ٤٠ بەڵام ٧٠ = ع . ٥٠٠ = ث ، ٤٠ = م بەم جۆرە ( زند ) بوو بە ( عثم ) وە ئەگەر بخرێتە ناو ( شیخان )ەوە ئەبێ بە (شیخ عثمان) کە مەبەستەکەیە ٠

لەمەوە دەر ئەکەوێ کە وشەی زیاد کرد دوو واتای هەیە لە هەمان کاتدا : (١) بەرز کردنەوەی خانەی پیتەکان (٢) تێهەڵکێشانیان لە وشەی شیخان ٠ مەبەستی یەکەم لە بەیتەکە زۆر ناسك‌و جوانە لە ڕووی سۆفییگەرییەوە ، هەر چەند مەسرەعی دووەمی تۆزێ تفت دەر ئەچێ لە ڕووی وتەوە : ( لفظ ) ٠

**ئاخر لەبڕێز بوو جام ، وتی‌ی تا کەی**
**ئیماو موعەمما ؟ ( صریحا ) سا دەی(١٨٥)**

مەولەویش داوا کەی بە جێ‌دێنێ‌و ئەڵێ :

**دائیم ڕوو بە ڕووی نیشان بێ گومان**
**تیر ئەندەر کەمان پیری ما عوثمان(١٨٦)**

بەڵێ بێ گومان ئەوەیە کە هەمیشە ڕوو بە ڕووی دڵی موریدان ، تیری وا لە کەواندا‌و بە فیووضات‌و واتای بەرز تیر بارانیان ئەکات ، پیری ئێمە : (عوثمان) .

پاش ئەم ناو هێنانە مەولەوی‌ی درێژە ئەدا بە لێدوانەکەی‌و ئەڵێ :

**بێ تەلوین لە بورج تەمکیندا مەکین**
**( روح الله روحـــــە آمیـــــن )(١٨٧)**

---

(١٨٥) لەب ڕێز : لێو ڕێژ ، پڕ بوو بە جۆرێ لێی بڕژێ . ئیما ( ایماء ) : ئیشارە ، هێما . موعەمما ( معما ) : جۆرێکی تایبەتە لە شێوەی دەر بڕینی تەم‌و مژاوی‌ی لەسەر یاساو ڕێ‌و شوێنێکی بڕیار دراو ، بە زانستێکی تایبەت دراوەتە قەڵەم لە تەعمیە ( تعمیة ) : وەرگیراوە چونکە کوێر کردنی تێدایە .. صەریحا : دەقاو دەق ، بێ هێماو پێچانەوە .

(١٨٦) ئەندەر : لە . کەمان : کەوان . پیر : وشەیەکە بۆ پیاوی گەورەو ڕابەر بەکار هێنراوە واتای شێخ دەگرێتەوە . ما : ئێمە ، فارسییە .

(١٨٧) تەلوین ( تلوین ) ڕەنگ کردن ، مەبەست ئەو بارو ڕەنگانەیە بە سەر موریدا دێت لە بڕینی پلەکانی طەریقەتدا تا پێ دەگات ، کەپێ‌گەی‌ی باری تەلوین نامێنێ‌و ئەچێتە دۆخی تەمکینەوە

بێ گۆڕان : (تلوین) له قوللەی جێگیرییدا (تمکین) نیشتەجێبووە٠ خودا بەردەوام بێ لـە بووژاندنەوەی ڕەوانی پاکییدا !!

وە ئەگەر پایەت هێشتا بۆ دەر نەکەوتووەو بەڵگەی هەست پێ کراوت دەوێ فەرموو گوێت لەمە بێ :ـ

**دەدا گەردی خـاك ڕێگەی دەروێشان**
**نیشانێ لـە شان سەرکاریی ئێشان(١٨٨)**

تەپو تۆزی هاتو چۆی دەروێش و موریدەکانی نیشانێك ئەدا لـە شانی سەرکارو شێخەکەیان ؛ چونکە دیارە ئەم هەموو بەگاڵتەو بێ هوودە دوای نەکەوتوونو بەگەرمیی ئامۆشۆیان نە کردووە ٠ لە پاشا کۆتاییی بـە باسی شێخ وەسمان خۆی دێنێ بەم دوو بەیتە جوانە :ـ

**ئەر خۆڵت بە طالیب ثەواب دەزانیی**
**بخوێنە قورئان ڕەسـمی عوثمـانیی(١٨٩)**

---

بورج : قوللە ٠ تەمکیین ( تمکین ) : جێگیریی مانە گۆڕاویی ، کۆتاییی پلەکانی ڕێی سۆفییگەریی ٠ مەکیین : نیشتەجێ ، جێگیر ٠

روح : ببووژێنێیتەوە ، بۆ نزا بەکار هێراوە ٠

(١٨٨) نیشانێ : تەواوکەری ( دەدا )یە ٠ شـان : یا کوردییـە ، یا عەرەبییەو سووك کراوی ( شأن )ە ، لە چاپەکەدا ( شأن ) نووسراوە من دەست نووسەکەم هەڵبژارو کە ( شان )ە ٠

سەرکاری ئێشان : سەرکاری ئەوان ، واتە شێخ کە کار بە دەستی ئەو دەروێشانەیە ، وشەی ئێشان فارسییە ، واتە ئەوان ٠

(١٨٩) طالیب ثەواب : داواکەری پاداش ٠ ڕەسمیی عوثمانیی : وەك شێخ وەسمان بە حوزووری دڵەوە ، لێرەدا تەورییە هەیە چونکە ڕووی کارەکەی وا دەگەیێنێ قورئانی رەسمو لخەطی عوثمانیی بخوێنەو ئەمەش مەبەست نییە ٠

( هـــل رقـــب نعـــة ؟ لا ولا الا
لا حـــــــول ولا قـــــــوة الا )(١٩٠)

ئەگەر خۆت بە تالیبی پاداش دەزانی‌ی قورئان لەسەر ڕێو شوێنی شێخ وەسمان بخوێنەو ئاگات لە هێما عیرفانیەکانی بێو ئەگەر گەیشتیتە ئایەتی ( لا یرقبون في مؤمن الا ولا ذِمَّة ) باش لە سەری ڕاوەستەو ئەم پرسیارە لە خۆت بکە : ئایا شێخ هیچ پەیمانێ لەگەڵ دوور لەخوادا کاندا ئەبەستێ ؟ نە خەیر نەك پەیمان بەڵکو خزمایەتیش لـە گەڵیاندا گـوێ ناداتێ چونکە لـە تەلوینو گۆڕان دەرچووەو هیچ جۆرە پەیوەندییەکی لەگـەڵ کەسـانی لەخـودا دووردا نەمـاوەو ڕێك‌و پێك بە پێی ئایـەتی ( فاستَقِمْ كما أُمِرتَ وَمَنْ مَعَكَ ) بە سەر ڕاستە شەقامدا دەڕواو بـە هیچ لایەکدا لانادا .

هێزو توانا هەر بە خودای بەرزی گەورەیەو هەر ئەوییش یارمەتی‌ی شێخی بۆ گەیاندنیە ئەم پایە بەرزە داوە .

لێرەوە مەولەوی‌ی دەست ئەکات بە باسی کوڕە ڕابەرەکانی شـێخ

---

(١٩٠) هل رقب تا ... د : هێمـایە بۆ ئایەتی (١٠) لە سـوورەتی بەرائەت : ( لا یرقبون في مؤمن الا ولا ذمة ) واتە کافرەکان لەهیچ خاوەن باوەڕێکدا نە خزمایەتی‌و نەپەیمان ڕەچاو ناکەن ، مەبەستی مەولەوی‌ی هەر وەکو لە پەراوێزێکدا دەر ئەکەوێ ئەوەیە چونکە شێخ لەتەلوین تێپەڕییوەو هیچ جـۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ ئـەهلی قەسوەتدا نەماوە هەرخوێشێ یاخاوەن پەیمانێ لەگەڵیا ئەگەر لای‌دا لە ڕێ ئەوییش بە تەواوی‌ی پەیوەندی‌ی لەگەڵدا ئەبڕێ بە پێی : ( فاستقم کما امرت ومن معك ) کە فەرمان بەتەمکیین دەدات .
حول ، قوة : هێز ( الا ) تەواوەکەی : ( بالله العلي العظیم ) لەبەر بەناوبانگی‌ی مەولەوی‌ی کرتاندوویەتی ، بەتیەکە جیناسی تیدایە ( الاّی یەکەم : خزمایەتی‌ی دووەم : مەکەر ) .

بە پێی بەرواری لە دایك بوونیانو لە پێشا ئەم پێشەکیە جوانەی بۆ ئەکات بە سەرەتا :ـ

**چ تەرزە دای بەر ئەم طەرزە خییار ؟**
**کـام داره نەوری ( قلبنـا أنار ) ؟(١٩١)**

**هو الشیخ هم ولده الابرار**
**هو الشیخ هم نجله الاحرار(١٩٢)**

**مظاهر ما فیه مستتر**
**بطرز أبرز ووجه ازهر(١٩٣)**

چ تەرزێکە ئەم بەرە چاكو بەتامانەی داوەو پێی گەباندوون ؟ چ دارێکە گوڵی پشکووتووی دڵیی ڕووناك کردینەوە ؟

---

(١٩١) تەرز : پەلکی ڕووەك · دای بەر : بەرو بوومی دا · ئەم طەرزە خییار : ئەم جۆرە پیـاو چاکانە · نەوری : گوڵەکەی ، نەور ( نور ) : گوڵی دار ، یا سپییەکەی ڕاناوی (ی) بۆ ( کام داره ) ئەچێتەوە ( قلبنا أنار ) : دڵمانی ڕووناك کردەوە ·

(١٩٢) هو : ئەو ، یەکەم بۆ تەرز ئەچێتەوە ، دووەم بۆدار · هم : ئەوان ، یەکەم بۆ ( خییار ) ئەچێتەوە دووەم بۆ ( نەور ) · ولد : کۆی ( ولد ) : کوڕ ، منداڵ · الابرار : کۆی ( بر ) ، چاك ، دەر نەچوو لە فەرمانی باوکو دایك · نجل : کوڕ ، نەوە ، بۆ تاكو کۆمەڵ بەکار دێنرێ · الاحرار : کۆی ( حر )ە ئازاد ·

(١٩٣) مظاهر : کۆی ( مظهر ) : دیمەن شوێنی دەرکەوتنی شت · ما فیه مستتر : ئەوەی لە شێخدا شاراوەتەوە · بطرز أبرز : بە شێوەیەکی چاكترو شیاوتر بۆ خودا · ووجه أزهر : وە ڕوویەکی ڕووناکتر ، ئەم دووانە بە ستراون بە ( مستتر )ەوە چونکە ئەگەر بەستەبن بە ( مظاهر )ەوە وا ئەگەیێنێ کوڕەکانی شێخ لە خۆی چاکتربن ئەمەش لەوە ناچێ مەبەستی مەولەوی بێ ·

دیارە ئەو تەرزە هەر شێخەو بەرە چاکەکانیشی کورە گوێ ڕایەڵەکانێتی • ئەو دارەش هەر شێخەو گوڵەکانیش کورە ئازادەکانێتی، بەڵێ :ــ

ئەم کوڕانە شوێنی سەرهەڵدانی ئەوەن کە بە شێوەیەکی جوانترو بە ڕوویەکی ڕووناکتر لە شێخدا شاراوەتەوە • ئەنجا دەست ئەکات بە باسی هەر چوار کوڕە ڕابەرەکەی شێخو ئەڵێ :

**سەر کردەی ئەصحاب با وەفاو صەفا**
**یەکێ بولبەها یەکێ بولوەفا(١٩٤)**

**دەشێ چی‌ی بڵێ لە وەصفیان کەس ؟**
**موحەممەدی‌ی خولق ، ڕەحمانی‌ی نەفەس(١٩٥)**

سەرکردەی هاوەڵانی دڵسۆزو بێگەرد ، یەکێکیان خاوەن بەها ( بهاءالدین ) یەکێکی تریان خاوەنو وەفا ( ابو الوفا ) • ئەبێ لەمەدحو باهەڵدانیانا کەس لەمە پتر چی بڵێ : کە یەکەم ڕەوشت موحەممەدییە (محمد) دووەم هەناسەی ڕەحمانییە (عبدالرحمان) •

---

(١٩٤) **ئەصحاب ( اصحاب ) : کۆی صەحبە ( صحب ) : یار ، هاوەڵ •** وەفا ( وفاء ) : دلسۆزی‌ی • صەفا ( صفاء ) : بێخەوشی‌ی ، بێگەردی‌ی ، یەکێ بولبەها : هێمایە بۆ لەقەبی گەورەکەیان کە ( بهاءالدین )ە • بو لوەفا : هێمایە بۆ کونیەی دووەمیان کە ( أبو الوفا )یە •

(١٩٥) موحەممەدی‌ی خولق : ڕەووشتی وەك ڕەووشتی پێغەمەر وایە هێمایە بۆ :ــ ناوی شێخ ( بهاءالدین ) کە ( محمد )ە • ڕەحمانی‌ی نەفەس ، هەناسەیەکی خودایی‌ی هەیە ، هێمایە بۆناوی ( ابو الوفا ) کە ( عبدالرحمان )ە •

ئەم دوو بەیتەی سپارد بەدووبرا گەورەکـە : شێخ موحەممەدیی بـە ناو بانگ بە ( بهاءالدین )و حاجیی شێخ (عبدالرحمان)ی بە ناو بانگ بـە ( ابو الوفا )و بـە هێما ئەم ناوو شۆرەتەیشی گەیاندن‌و ئـەم بەیتەش ئەسپێرێ بـەو دووانەکەی تریان :

**یەکێ ئایینەی فاروقیی عومەر**
**یەکێ حەقیقەت ئەحمەدێ سیبەر(١٩٦)**

یەکێکی تریان ئاوێنەیەکی فاروقییـە (فاروق) تەنها وێنەی ڕاسـت دەدانەوەو ناویشی (عمر) عومەرە ، چواردەین ، ڕاستییەکی ئەحمەدیی (أحمد) ڕەوشتە • تا بەم جۆرە ناوی دووانەکەی تریشی گەیاند کە شێخ عومەری بـە ناوبانگ ( ضیاءالدین )و حاجیی شێخ ئەحمەدە(١٩٧) •

---

(١٩٦) ئایینە : ئاوێنە • فاروقیی ( فاروقی ) نیسبەتە بۆ ( فاروق ) کە لە قەبی عومەری کوڕی خەططابە چونکە ڕەوای لە نا ڕەوا جیا کردەوە ، بەپێی نزای پێغەمبەر (د•خ) ئەمەیان بۆسێهەم کوڕی شـێخە کـە شێخ عورمەری بـە ناو بانگ بـە ( ضیاءالدین )ە ( فاروق ) لەقەبێتی هەر وەها غولام موحەممەدییشی پێ ئەڵێن • سیبەر ( سیر ) : گوێ سیرەتە ( سیرة ) ڕەووشت ، لێرەدا هێما بۆ ناوی بچووکترین کوڕە ڕابەرەکانی شێخ ئەکـات کەحاجیی ئەحمدبووە •

(١٩٧) مەولەویی هاتووە ناوی کوڕە ڕابەرە کانی شێخی :ـ
أ ـ بە پێی سالی لە دایك بوونیان باس کردووە •
ب ـ دوو بەیتی داناوە بۆ شێخ موحەممەدو شێخ عەبدو ڕەحمان • بۆ دوانەکەی تر یەك بەیتی داناوە •
جـ ـ ناوو لەقەب یا ناوو کونیەی یەکەم دووەی بە هێما گەیاندووە بەڵام بەس ناوی دووانە بچکۆلەکەیانی بردووە ، فاروقییش لەقەبێکی گشتیی هەموو عومەر ناوێکە ، ئەگە بیبوییستایە

لەپاشا هەموویان کۆ ئەکاتە دە لەژێر سێبەری ئەم بەیتەداو ئەڵێ :

**ثابیتو سەییار بورجی تەمجیدن**
**نیشانەی ئەهلی سەمای تەوحیدن(۱۹۸)**

هەموویان ئەستێرەی بورجی تەمجیدن ، هەندێ گەڕۆکو هەندێ جێ گیر ، گشت نیشانەی پەناو دڵنیایی‌ی ئاسمانی تەوحیدن ، ئەنجا ەولەوی‌ی ئاووڕێك بە شێوەیەکی گشتی‌ی لە پیاوانی هەموو زنجیرەکە ئەداتەوەو ئەڵێ :

**سێوەری شەجەر موجەددیدییە**
**حاصلی هیممەت عالی‌ی نەقشیییە(۱۹۹)**

---

هێمای بۆ (ضیاءالدین) ئەکرد ٠

د ـ بەرواری لە دایك بوونو وەفاتی شێخو چوار کوڕەکەی بەم جۆرەیە

١ ـ شێخ عثمان (١١٩٥ ـ ١٢٨٣)
٢ ـ شێخ محمد (١٢٥٢ ـ ١٢٩٨)
٣ ـ شێخ عبدالرحمان (١٢٥٣ ـ ١٢٨٥)
٤ ـ شێخ عمر (١٢٥٥ ـ ١٣١٨)
٥ ـ شێخ أحمد (١٢٦٦ ـ ١٣٠٧)

(١٩٨) ثابیت ( ثابت ) : جێگیر ، سەییار ( سیار ) : گەڕۆك ٠ تەمجیید ( تمجید ) : بە گەورە گرتنی خودا ٠ سەما ( سماء ) : ئاسمان ٠ تەوحیید ( توحید ) : خودا بە یەك گرتن ، دان بە یەك خوادا نان ٠

(١٩٩) سێوەر : سێبەر ٠ شەجەر ( شجر ) : درەخت ، موجەددیدییە ( مجددیة ) : طەریقەتی نەقشبەندی‌ی پاش ، نوێ کردنەوەی لە لایەن ئیمامی ڕەببانییەوە ٠ حاصلی هیممەت عالی‌ی : سەرجەمی یارمەتی‌ی بەرز ٠ نەقشیییە ( نقشیة ) : طەریقەی نەقشبەندی‌ی ، نیسبەتە بۆ یەکەم پارچەی ناوی : ( نەقشبەند ) ٠

**ڕجام هەس بێرێ باری پەستو بەرز**
**بەو سیلسیلە ئـەم ، سیلسیلە بەم طەرز(٢٠٠)**

**تاوەختی نوزول نوبووەت مەهــدیی**
**طولوعی کەوکەب دەولەتی مەهــدیی(٢٠١)**

سێبەری دەرەختی ئەم شێوازی موجەددیدییە کـە سەر ئەنجامی دیمەنی بەرزی شێوازی نەقشییە ـ تکام هـەیە ـ بیهێنێ بەرزو نزم بـە شێوەی ئەو زنجیرەی کە لەمەوپێش پیایدا هاتووەتە خوارەوە ، وە هـەر وەها ئەم زنجیرەی شێخ وەسمانو کوڕەکانیشی بەو شێوە بـەرزو نزم بهێنێ تا هاتنە خوارەوەی عیسـاو هەڵهاتنی ئەستێرەی فەرمان ڕەوایی‌ی ماهدیی •

ئەنجا کۆتایی‌ی دێنێ بە باسەکەو ئەڵێ :

**ئاخر هات بە ذیکر ئـەم بوزورگانە**
**نیشـانـەی حوســنی خاتیمـەمانـە(٢٠٢)**

---

(٢٠٠) هەس : هەیە • بێرێ : بهێنێ • باری ( بارئ ) : خودا • پەست : نزم • بەو سیلسیلە : بە هۆی یا بە شێوەی زنجیرەی موجەددیدییە • ئەم سیلسیلە : ئەم زنجیرەی شێخانی تەوێڵە : شێخ عثمانو کوڕەکانی • بەم طەرز : بەم شێوەی کە لـە بەیتی دووایدا باس ئەکرێ ، شیۆەی بەردەوامی‌ی تا هاتنە خوارەوەی عیساو دەولەتی مەهدیی یا پەستو بەرز ئەمانیش بهێنێ •

(٢٠١) نوزول ( نزول ) : هاتنە خوارەوە لە ئاسمان • نبووەت (نبوة) : پێغەمەرێتی‌ی • مەهدیی : یەکەم نیسبەتە بۆ مەهد ( مهد ) : بێشکەو مەبەست عیسایە (د•خ) چونکە لـە بێشکەدا ئـەدوا ، دووەم ئیسمی مەفعولە لە بنەڕەتداو مەبەست مەهدیی چـاوە ڕوانکراوە ، دیارە جیناسیان لە نێواندا هەیە •

(٢٠٢) ئاخر هات : کۆتایی‌ی هات • ذیکر ( ذکر ) : باس کردن ، لێدوان • بوزورگان : کۆی بوزورگە : گەورە • حوسنی خاتیمە :

باسەکە کۆتاییی هات بە لێدووانی ئەم پیاوە گەورانەو ئەمەش نیشانەی جوانیی کۆتاییمانە ، چ کۆتاییی باس چ کۆتاییی ژیان •

پاش لێبوونەوە لە بنەڕەتی چوارەم دەست بە بنەڕەتی پێنجەم دەکات، کە بڕوایە بە دووا ڕۆژو هەندێ لە نیشانەی نزیك بوونەوەی هەڵئەدا تا ئەگاتە ئەم بەراووردە ناسکە لە نێوان مردنو ژیاناو ئەڵێ :ـ

**عەلامات زۆرن قصەی لێ ناکەین**
**بەیانی ئەحوال بەرزەخ بێتە بەین(٢٠٣)** ـ

**مەعلووم لە ئالای یەکێ حەیاتە**
**بەڵێ ئالای گشت ئالای مەماتە(٢٠٤)**

**وەسیلەی مەهیین ( متاع فلیل ) ؟**
**ڕێی دینی میهیین ( مطاع جلیل ) ؟(٢٠٥)**

---

ناسکیی تێدایە ، چونکە دوو واتا هەڵئەگرێ یەکەم جوانیی کۆتاییی ژیان ، لەم بارەدا نوقلانە ئەبێ بە ئیمان دەربردنو مردنی لەسەر بیرو باوەڕو کرداری چاك دووەم کۆتاییی باسی ڕێبازی سۆفییگەریی‌و پیرەکانی یا ئەصلی چوارەم •

(٢٠٣) عەلامات ( علامات ) : نیشانەکانی نزیك بوونەوەی دووا ڕۆژ • بەرزەخ : مەبەستی دنیاو پاشە ڕۆژە هەر وەکو خۆی لە پەراوێزێکا باسی کردووە ، لە شوێنانی تروا بە واتای ناوەندی هەر دووکیان بەکار دێنرێ •

(٢٠٤) ئالا ( آلاء ) : خێرو بیر • ئالاّ ( أعلى ) : بەرزتر یا بەرزترین • حەیات ( حیاة ) : ژیان • مەمات ( ممات ) : مردن ، لە بەیتەکەدا جیناس هەیە •

(٢٠٥) وەسیلە : هۆ • مەهیین ( مهین ) : لە مەهانە ( مهانة ) وەرگیراوە مەبەست پەستیی‌و بێڕێزییە • مەتاع ( متاع ) : ئەوەی خۆشیی دەدات • میهیین فارسییە ، واتە گەورەو بەنرخ • ( مطاع ) : بەگوێکراو • ( جلیل ) : گەورە •

نیشانەکانی نزیك بوونەوەی پاشە ڕۆژ زۆرن‌و ئەوانەی لەمەو پێش باس کرا بەسەو بـا باسێك لـە بارو دۆخی ژیان‌و مردن بکەین •

ئاشکرایە یەکێ لە خێرو بێرەکانی خودا ژیانە بەڵام لە هەموویـان بەرزتر خێرو بێری مردنە • ئایە ئەمانە وەك یەك وان :

ژیانێ کە هۆی پەستیی‌و بێ‌ڕێزیی ئـەم ڕابوواردنە کورتەیـە ؟
یا مردنێ کە ڕێبازی بینینی خاوەن شکۆی فەرمان ڕەوای گەورەیە ؟
نەخەیر جیاوازیان زۆرە :ــ

**خوصوص کە حەیات پەنجەی دا لە عوود**
**هەس نەوای سیوای لە : ( انا الموجود ) ؟(٢٠٦)**

**نە ئولوهیییەتی حەق حەق هووەیداس**
**نـــە عوبودیییەتی خالیصـــە پەیداس(٢٠٧)**

بە تایبەت کە ژیان پەنجەی لە تاری بوون دا جگە لە ئاوازی ( هەر من هەم ) نابێستیی‌و هەر کەسێ ئەی گرێت لە ناخی دلیـا هەست هـەر بـە خۆی دەکاو شتان‌و کەسانی‌تر بە پەروانەی دەوری خۆی دێتـە بـەر

(٢٠٦) خوصووص ( خصوص ) : بە تایبەت • عوود ( عود ) : ئامێرێکی مۆسـێقای ژێدارە • مەبەست مۆسیقای بوونە کـە دەربڕینەری زاتە• هەس: هەیە• نەوا: ئاواز• سیوا ( سوی ) ، جگە • ( انا الموجود ) : هەر من هەم ، خۆ پەرستیی •
(٢٠٧) ئولوهیییەت ( الوهیة ) : خودایەتیی • حەق ( حق ) یەکەم خودا دووەم بە ڕاستیی‌و لە خودی خۆیا ، جیناسیان لە نێواندا هـەیـە • هووەیداس : ئاشـکرایە ، دیارە • عـوبوودیییـەت ( عبودیة ) : بەندایەتیی • خالیصە ( خالصة ) : پوخت ، ڕووت • پەیداس : پەیدایە ، دیارە ، هاتووەتە دیی ، هەیە •

چاو ، لـه بەر ئەم خۆ پەرستیە نە خودایەتی‌ی خـودای بە ڕاسـتی‌ی بۆ دەرئەکەوێو نــە بەندایەتی‌ی ڕووتی بۆخۆی بۆ دورسـت ئەبێو هــەر لە ڕوانگەی بینینی خۆیەوە تەنانەت سەیری ئەم مەسەلانەش دەکات ئەنجا درێژە بە باسەکە بـە شێوەیەکی تەمو مژاوی‌ی ئەداو ئەڵێ :ـ

**بێـــلان ، دییت چلۆن دەنەوییـــەوە**
**چییە ؟ ڕاس نـەبێت بــە زەوییەوە(٢٠٨)**

بهێڵە بـا ئەوەی داوای : ( هەر من هەم ) دەکات بمرێ تا دەرکەوێ داواکەی چەند پووچو ئەندەڵە ، بەڵێ ببینیت چۆن دەنەوییەوەو بەچۆکا دەهات بـە پێچەوانەی داواکەی خۆیەوە ؟ دەك ڕاس نەبێتەوە ، بۆ سـەر لێشێواوی‌یو خۆ بە زل گرتنی ، ڕاستە هەر وەکـو خودایـەتی‌ی ڕەزا پێش مردن ئاشکرا نیە هەر وەها بەندایەتی‌ی پوخنەش بەدی‌ی نایــەت ، بەڵام کە مردن هاتە کایەوە ئەو کاتە :

**سائیلو موجییب با حەق هەر خۆی وێ**
**ڕوو بنوێنێو کـار موددەعی‌ی طـەی وێ(٢٠٩)**

بەڵێ کە مرد ئەو وەختە بەندایەتی‌ی پوختی بۆ بەرهەم دێو هەموو

(٢٠٨) بێلان : بهێڵە ، بێڵە · دییت : ببینییت · چلۆن : چۆن · دەنەوییەوە : دەچەمییەوە واتە ئەوەی وای دەزانی ئەخست کە هەر خـۆی هەیە · چییە ڕاسی نەبێت بە زەوییەوە : نزای خراپـە ، لەجیاتی‌ی : ( دەك ڕاست نە بێیەوە ) بەکاری هێناوە ·

(٢٠٩) سائیلو موجییب : پرساو وەڵامدەر · حەق ( حق ) : خودا · وێ : بێ · ڕوو بنوێنێ : خۆی دەرخا · کار موددەعی : ئیشی ئەوەی بەداوایە لەسەری لە پاشە ڕۆژدا · طەی وێ : بپێچرێتەوە ·

کارێکی ئەسپێرێ بە خودا با هەر خۆی پرسیار بکاو هەر خۆیشی وەڵام بداتەوە ، ئەو کاتە خودا پەردەی نهێنیی لەسەر خـۆی لادەداو خـۆی ئەنوێنیو ئیتر کەس پرکێشمیی ئەوە ناکات ، پرسا بێ لـەو بەندەی کـە ئەو ، کارو باری ئەویی گرتووەتە دەست .

ئەگەر ئەشتەوێ بزانی چۆن خودا ڕووی خۆی دەنوێنێ باش گوێ لەمە بگرە :ـ

که کەوتە لاوە ماسیی بێ نم بوو
تەقابول لاچوو چیی ذەڕەی گم بوو(٢١٠)

مەوجو تەشاوی گشت چوونـە لاوە
دەریا صاف ، خورشیید هەر وەك خۆی ماوە(٢١١)

دوای هەڵکردنی گێژەڵووکەو داکردنی لێزمەو بەرز بوونـەوەی لافاوو بەیەکادانی شـەپۆلی کێوئاسای دەریای ژیان ، ماسیی : ( مرۆڤ ) پساو هەڵدرایە کەنارو لێوار ، گێژەڵووکە نەماو ئاسمان بێ نم بوو ، باران

(٢١٠) کە کەوتە لاوە ماسیی : مەبەستی مردنی مرۆڤەو لاکەوتنێتی لە دەریای ژیانو بوون . بێ نم بوو : واتە ئاسمانی ژیان لە باران وەستایـەوە . تـەقابول ( تقابل ) : بەرانبەر وەستان ، واتـە شەپۆلەکانی دەریای ژیان نرم بوونەوە . چیی ذەڕەی گم بوو : هەموو تنۆکێکی ون بوو . گم : گوم ، ون ، نادیار .

(٢١١) مەوج ( موج ) : شەپۆل . تەشاو : شەپولی کەنار کەئەگاتە سەر زەویی . چوونە لاوە : لاکەوتنو تەمان . دەر یاصاف : بێهەورو بارانو گێژەڵووکەو شەپۆل ، مەبـەست دریای ژیانی ئەومرۆڤەیە کە مردووە .
خورشیید : خۆر مەبەستی لێرەدا خودایە ، کـە بـە جوانترین شێوە بۆ مان دەر ئەکەوێ پاش مردن : ( فبصرك اليوم حديد ) .

وەستاوەو شەپۆل دامرکا ، دەرەو تۆزی نەماو ، شەپۆلەکان هەموو کەوتنە لاوەو ، ئاسمان سایەقەی سامال • ئەم هەموو گۆڕانە ڕوویدا بەلام خـۆر ( خودا ) هەر وەکو خۆی مایەوە ، بەلێ هـەر خۆرە هۆی ئـەم هـەموو گۆڕانو ڕوودانەیەو هەموویان ئەڕۆن تەنها خۆی دەمێنێتەوە• ئەم ڕاستییە ئێستە بە تەواوی‌ی دەرناکەوێ مەگەر پاش مردن ، کە گیان لە کۆتی تەن ڕزگار ئەبێو نە ، تەپو تۆزی ماددەو نـە تەمو مژی خەوی بـەدوو نـە هەورو هەلای ئارەزوو ڕووی ڕۆژی ڕەواو ڕاستی‌ی لێ دەشارێتەوە•

ئەنجا مەولـەوی‌ی وەك پێمان بلێ : ئێمە چیمانـە لـە دووا ڕۆژی گەورەو نیشانەکانی ؛ چونکە وەکو پێغەمەر (د•خ) دەفەرموێ : (مَنْ ماتَ فَقَدْ قامَتْ قِیامَتُه ) ئەوەی بمرێ ئـەوا پاشـە ڕۆژی ئەو بەرپـا بووە • ئێمە کەوابوو ئەبێ باسی نیشانەکانی پاشە ڕۆژی خۆمان بکەین • دە فەرموو تۆزێ ورد بەرەوە :

**چـــاوی بـەصیرەت ئێمـــە مژمۆرە**
**ئەگەر نە پێشرەو عەزرائیل زۆرە :ـ(٢١٢)**

**ڕووینی یاران گشت بـە دلگیری‌ی**
**بگردنی عومرو ضەعیفی‌یو پیری‌ی(٢١٣)**

**هـەموو پێت دەلێن : چـاوت واتێوە**
**تـــەدارەك بکـــە زوو بێ وە ڕێوە(٢١٤)**

---

(٢١٢) بەصیرەت ( بصیرة ) : هێزی ناسینی دل • مژمۆر : پڕوو پووشاوی‌ی ؛ کزو موودار • عەزرائیل : فریشتەی مردن •
(٢١٣) ڕۆیینی یاران :مردنی هاوەلان • دلگیری‌ی : خەمو پەژارە • بگردنی عومر : تێپەڕینی تەمەن •
(٢١٤) تەدارەك بکە : خۆت ئامادەکەو کەلو پەلی پێویست پەیدا کە •

چاوی دڵمان کوت‌و کوێرو پڕوو پووشاوییە ، ئەگەر نا پێشیرەوو پێشەنگی ئیزرائیل زۆرە :

سەیرکە چۆن یاران‌و دۆستان بە دڵگیرییەوە گشت سەریان‌نایەوە نە کەس پرسی پێ کردن‌و نە مافی هەڵبژاردنیشیان درایە ، ئەمە یەکێ لەوانی‌تریش تێپەڕینی تەمەن ، لاوازی‌ی‌و بێ‌هێزی‌ی ، دیاردەکانی پیری‌ی : سپی‌ی هەڵگەڕانی موو ، کەل‌و کۆمی‌ی .... ، هەموو ئەمانە بە زمانی حاڵ پێت دەڵێن : خۆ تۆ چاووت لێمانە کەوابوو خۆت ئامادەکەو توێشووی تەواو هەڵگرەو زوو وەك یاران ، ملی ڕێگە بگرەبەر .

لە پاش ئەمە لەسەر باسەکە دەڕوات تا ئەگاتە مەسەلەی پرسیارو وەڵام‌و سزادانی مردوو لە گوڕداو ڕەخنەی ئەوانەی کە دەڵێن :- کەس هەستی بە هاوار یا شتێکی تری مردوو نەکردووە کە ئەوە بگەیێنێ ئەم کارانەی بە سەردا دێت ، بەرپەرچ ئەداتەوە بەم جۆرە :-

ئەم نەشنەفتەن‌و نەدیینی تۆیە
ناوێ بە نافی‌ی ئەم گفتوگۆیە(۲۱۵)

دەلائیل زۆرن باوەڕت بوێ
تێ‌فکری‌ی لە لات کەسێ دەنوێ

لە خەودا دەگری‌ی‌و دەنێ‌و دەشنەوێ
هەڵدەسێ‌و دەڕۆت پێی هەڵدەکەوێ(۲۱٦)

---

(۲۱۵) نەشنەفتەن : نەبیستن . نەدیینی : نەبینینی . نافی‌ی : لابەر ، داڕن .

(۲۱٦) دەشنەوێ : ئەبیستێ . دەڕۆت : دەڕوات ، لە نوسخەکاندا بەم جۆرە نووسراوە ( دروت ) ، ئێمەش بەو جۆرەمان چەسپاند .

**ئـــازاری دەوێ یـــا شـــادمانیی**
**تۆیچ هەر وای لە لای هیچ لێ نازنیی**

بەڵێ ئا بەم جۆرە ئاسانە وەڵامیان ئەداتەوەو لە پاشا ئەچێ بە گۆیی ئەوانەدا کە دەڵێن : نەماو (معدوم) وەك خۆی لێ نایێتەوەو هەر چۆن بێ هەر جیاواز ئەبێ لەگەڵ بوونی پێشوویدا ، تەنانەت مرۆڤـی زیندووزیش هەمیشە لە گۆڕاندایەو بۆ وێنە زەید دەستنیشانی (تشـخص) ئیمـساڵی هیی پاری نییەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە ، بـە لەرییو تەڵەوییو شت فێر بوونو بیر چوونەوەو شتیتر •

مەولەوویی دێ لە پێشا بە شێوەیەکی مەنتیقیی بەڵگەکەیـان پووچ ئەکاتەوەو لە پاشدا ئەم بەیتەش بۆ گاڵتەو لاقرتی ئەدا بـە قەدیانا :ـ

**زەید ئەر ئیمساڵییچ زەید نییە چییە ؟**
**گشت کەس دەزانێ پارێنە نییە •(٢١٧)**

بەڵێ قابیلە گوێرەکە بێ یا خۆ پارێنە ؟ هەموو کەس دەزانێ زەیـد هەر ئەوزەیدەیەو دەست نیشانی خـۆی لـە دەست نەداوە ؟ لەبەر ئـەوە لێپرسراوە لـە هەموو تاوانو چاکەیەك لەمەوپێش کردبێتییو شـایستی سزاو پاداشە لەسەریان • ئەنجا دەست ئەکات بـە بەڵگە هێنانەوە لەسـەر زیندووبوونەوەو ئەم بەیتەیشی بۆ ئەکات بە پاڵپشت :ـ

---

(٢١٧) زەید : ناوێکی عەرەبییە بۆ نێرینە لەبەر سووکیی زۆری بەکار دێنن لە زانارییەکانی زماندا بەتایبەت لە ( نحو )دا • ئیمساڵییچ : ئیمساڵییش : پارێنە :ـ گوێرەکەی یـەك ساڵە ، لـە بەیتەکەدا هێمایەکی ناسك هەیە بۆ ئەم مەبەستە •

## گەر دەکەی ئینکار یەکێ لەمانە
## تێلێتە چاووت قورئان بەنانە(٢١٨)

بەڵێ ئەگەر توکولی لە یەکێ لەمانە دەکەی قورئان سەرپەنجە ئەخاتە چاوت نەك بۆ کوێر کردنت بەڵکوو بۆ تێگەیاندنت •

کۆتاییی باس بە بنەڕەتی شەشەمی بیرو باوەڕ دێ کە باوەڕ کردنە بە چارەنووس : چاك بێ یا خراپ هەر لە خوداوەیە •

مەولەویی بە شێوەیەکی نائاسایی لەسەر ئەم باسە ئەڕواو گرنگییەکیی پتر لە پێویستی ئەداتێو مەسەلەی کرداری ئادەمیزاد دێنێتە کایەوە : کە بەندە هەر خۆی دوروستی ئەکات هەر وەکو موعتەزیلەکان دەڵێن ، یا خودا هەر خۆی دروستی ئەکاو بەندە زۆرلێکراوە هەر وکو جەبرییەیان : (جهمي) ئەڵێن ، یاخود جۆرە دەحڵو تینێك بۆ مرۆڤ هەیە هەر وەکو ئەشعەرییەکان بڕوایان وایە •

لە ناوەند ئەمانەشدا چەند بیرو باوەڕیتر هەیە کە لەڕاستییدا دەگەڕێنەوە بۆ یەکێ لەم سێ ڕا سەرەکییانە •

لە تاووتوو کردنی ئەم ڕایانەوە مەسەلەیەکی فەلسەفیی دێتە

---

(٢١٨) تێلێتە چاووت : ئەی کا بە چاوتا · قورئان بەنانە ( بنانە ) : لەمەدا ناسکیی ( لطائة ) هەیە چونکە بۆ ئەوە دەست ئەوا کە قوئان پەنجە ئەکات بە چاوتا بۆ ئەوەیش کە ( بنانە ) لە ئایەتی : ( بلی قادرين على أن نسوي بنانه ) ئەکات بە چاوتا زانیاریی چەسپاندوویەتی هێڵی سەر پەنجەی مرۆڤ هیی هیچ کەسێك لەویتر ناکاتو لەسەر ئەم بنەڕەتە پەنجەمۆر داهاتو پشتی پێ بەسترا بۆ دۆزینەوەی تاوان ، ئەمە هەر وەکو هەندێ لەزانایان ئەڵێن ، یەکێکە لە موعجیزەکانی قورئان ·

پێشەوە : ئایە هەموو کارێك یەکسەر هی‌ی خودایەو ڕاستەوخۆ بە ، ویستو توانایی‌ی ئەودوە بەستراوونو ئەو دروستیان ئەکات یان نا ؟ دیارە جەبری‌ی‌و ئەشعەری‌ی یەکەم پەسەند ئەکەنو فەیلەسووفەکانیش وەکو باوە لەسەر ڕای دووەمن ، بۆ وێنە ئەڵێن : ئاگر خۆی ئەسووتێنێ‌و سووتاندن کاری ئاگرە کەیەو خۆی کارای سروشتیە : ( فاعل بالطبع ) بەو واتایە کە سروشتەکەی ئەم کارەی بۆ پێویست دەکات بە جۆرێ پاش لێکەوتنی ئاگر لە شتێکی شیاو بۆسووتان نەسووتان ستەمەو سووتان هەر ئەبێ ڕووبدات •

ئەشعەرییەکان دەڵێن : سووتان ولێکەوتنی ئاگر دوو دیاردەن کە ڕەوشتی جیهانیان لەسەر دانراوەو هیچ پێویستییەك نیە بۆ ڕوودانی سووتان دوای لێکەوتنی ئاگر ، بە جۆرێ نەسووتانەکە ستەم بێ •

لە ناو زۆر نووسەری ئەم سەردەمەدا وا باوە ئەمە ڕای غەزالییەو ئەڵێن : لەم بیروباوەدا پێش دیکارتی فەرەنسی‌ی کەوتووە کە هەمان ڕای هەیە •

بەڵێ ئینکاری ئەوە ناکرێ کە غەزالی‌ی سوورێکی گەلێ بالای بووە لە چەسپاندنو ڕوون کردنەوەیدا ، بە جۆرێ قەڵەم لەو دراوە بەلام غەزالی‌ی خۆیشی بە ڕای ئەشعەری‌ی دائەنێ‌و خۆی بەخاوەنی دانانێ • مەولەوی‌ی لەمەسەلەی بیرو باوەڕی فەیلەسووفەکاندا ، هەر وکو هەندێ زانایانی تر پێی وایە ئەوەی کە باس کرا ڕووکارێ‌ی‌و کورۆکەکەی بە جۆرێکی ترە :

**شوهرەتی مەذهەب حوکەما وەیە**
**ئەوان لە لایان وەسایط هەیە(۲۱۹)**

---

(۲۱۹) حوکەما ( حکماء ) : کۆی حەکیمە ( حکیم ) : فەیلەسووف •

**( اما تحقيقا ) لای ئـــەوانییچ واس**

**موئەثثیری ( في الوجود ) هەر خوداس(٢٢٠)**

ناوبانگی بییرو باوەڕی فەیلەسـووفەکان بۆ بـاوەڕی یـەکێتیی : ( عقیدة التوحید ) زیان بەخشە •

؟ چونکە وا باوە ئەوان ناوەندیان لە تیین کردنا بەلاوە هـەیە بـەلاّم توێژانەوەی وتەکانیان دێتە سەر ئەوەی : خاوەن تیین لـە بووندا هـەر خودایەو بەس ، وەئەو ناوەندانە ئامێرو هۆو مەرجن بۆ تیین کـردنەکە • وە ئەگەر بەلگەنت ئەوێ گرێ لەم کورتە چیرۆکە بگرە :

**خەلاییق رۆیین ئـەلای ئەفلاطوون :**

**چیی دەلێی ؟ بڕۆین لە ترسی طاعوون ؟(٢٢١)**

**لـــە جوواویاندا قصـەی ئـەمەیە :ــ**

**تـەماتان چییـە ؟ عـالەم گـورەیـە(٢٢٢)**

---

وەیە : زیانە واتە بۆ باوەڕی یەکێتیی خودا • ئەوان تا ••• د : ڕوون کردنەوەی شۆرەتی بییرو وەڕی فەیلەسووفەکانە • وەسایط ( وسائط ) : کـۆی واسیطە ( واسطە )ەیە : ناوەند ، ئـەوەی بەشوارە لە گەیاندنی تییینی کارایەك بۆ کار لێکراوێك •

(٢٢٠) ( **اما تحقیقا** ) : بەلاّم لە ڕاستییو تۆێشکدا ، لە توێژانەوەدا • ئەوانییچ : ئەوانییش • موئەثثیری ( في الوجود ) : تیین دەر لە بووندا • خوداس : خودایە •

(٢٢١) خەلاییق ( خلائق ) : کۆی خەلقە ( خلق ) : خەلّك ، کەس • ئەفلاطوون : فەیلەسووفێکی بـە ناو بانگی یۆنانییە ، سەیری پێشەکییەکە کە •

(٢٢٢) جوواو ( جواب ) : وەلاّم : قصە : وتە • عالەم ( عالم ) : جیهان گورە ( کرة ) : گۆ ، خڕۆك ، تۆپ •

زەمیین مەرکەزە ، ئەفلاك وەك كەمان
حەوادیث وەك تییر ، ئینسان وەك نیشان(٢٢٣)

( واللە الرامـــي فأيـــن المفـــر ؟
( وهـذا الكـلام يشـعر بمـا مـر )(٢٢٤)

جەماوەر چوونە لای ئەفلاتوون پێشەواو فەیلەسووفی بـە ناوبانگی گریکیی‌و پێیان وت : چیی دەفەرمووی ؟ هەڵبێین لە ترسی تاعوون ؟ ئەویش بەم جۆرە وەڵامی دانەوە : بە تەمای چیین ؟ ئایا نازانن: گەردوون گۆیەو زەویش چەقەکەیەتی ؟ ڕووداییش وەك تیر وایەو ئاسمانەکانیش وەك کەوان :(٢٢٥) خوداش نیشانچییە ، ئیتر بۆ کوێ هەڵدێن ؟ بەڵێ ئەم فەرموودە ناسك‌و شاعیرانەی ئەفلاتوون ئەوە دەگەیێنێ کە هەر خودا هۆی کاریگەرەو بەس •

مەولەویی گەلێ بایەخ بەم باسە دەداو قووڵ بۆی دائەچێ‌و لق‌و پۆپی لێدەکاتەوە ، بـە جۆرێ نەك هەر لە دەرەتانی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە بەڵکوو وابزانم لـە دەرەتانی هۆنراوەکە خویشی دەرچووە •

---

(٢٢٣) زەمیین : زەویی • مەرکەز ( مركز ) : چەق ، ئەفلاك ( افلاك ) : کۆی فەلەکە ( فلك ) ئاسمان • کەمان : کـەوان • حەوادیث ( حوادث ) : کۆی حادیثە ( حادثة )یە : ڕووداو •
(٢٢٤) ( والله الرامي فأين المفر ؟ ) : خوداش نیشان چیە کەواتە شوێنی هەڵهاتن‌لەکوێوەیە ؟ ( وهذا الكلام يشعر بما مر ) ئەم وتەیە ئەوەی پێشوو ئەگەیێنێ ، کە خاوەن تیین لە بووندا هەر خودایەو بەس •
(٢٢٥) ئەمە لەسەر ڕای گریکییەکانە ، زەوییان بـە چـەقی گێتی داناوەو گوتوویانە چەسپاوەو ئاسمانەکان لەدەوریا دەسووڕێنەوە ، ئەم سووڕانەوە شیان کردووە بە هۆی هەموو ڕووداوێك ، ڕای ئیسلام‌و زانیاریی هاوچەرخی لەسەر نییە •

بەڵێ مەولەوی‌ی هەموو بیرو ڕاکان تاو توو ئەکاو پێچو پەناو کون‌و قوژبن نامێنێ سەری پێدا ئەکات ، تـا لـە ئەنجامدا ڕای شێخ ئەبولحەسەنی ئەشعەری‌ی پەسەند ئەکاو ئەڵێ :ـ

**خولاصە ، مەذهەب شێخی ئەشعەری‌ی**
**دای پۆشێ ڕەحمـەت باری‌ی یەکسەری‌ی(٢٢٦)**

**هـەر کەس تەتەببوع ئەحادیثی کرد**
**لە ئایاتدا تێفکری‌ی ورد ورد ٠٠٠٠(٢٢٧)**

**لـــەم مەسئەلەدا لێی ظاهیـر دەوێ**
**حەق هەر ڕێی ڕەئیی ئەوی دەکەوێ(٢٢٨)**

**بەل لە هەموو بەحث ئوصوولی دییندا**
**هەر ڕەئیی ئەوە چاك چاك تەسکیین دا(٢٢٩)**

---

(٢٢٦) مەذهەب ( مذهب ) : بییرو باوەڕی تایبەتی‌ی زانا کە لە بەڵگەوە وەری‌ی گرتبێ‌و لە بییر کردنەوە یا کار کردندا لە سەری‌ی بڕواو ڕەچاوی کات ٠

(٢٢٧) تەتەببوع ( تتبع ) : بە دواداگەڕان ٠ ئەحادییث ( أحاديث ) : کۆی حەدیثە ( حديث ) : فەرموودەو کردارو ڕەوشتی پێغەمـەر (د٠خ) ٠ ئایات ( آيات ) : کۆی ئایەتە ( آية ) : هەندێکی تایبەت لە قورئان سەرەتاو کۆتاییەکی دەست نیشانی هەیەو لە سوورەت بچوك ترە ٠

(٢٢٨) مەسئەلە ( مسألة ) : پرسیارەکە ، باس ٠ حەق : ڕاستی‌ی ، ڕەوایی‌ی ٠ ئەوی : ئەو ، واتە ئەشعەری‌ی ، یا ئـەوێ ، واتـە مەذهەبەکە ئەشعەری‌ی ٠

(٢٢٩) بەل : بەڵکو ٠ بەحث ( بحث ) : باس ٠ ئوصوولی دیین ( أصول الدين ) بنەڕەتەکانی ئایین ، ناوێکی تری زانیاری‌ی کەلامە هەر وەکو باسمان کرد ٠ تەسکیین دا : تیینوێتی‌ی بشکێنێ ، ئارەزوو بشکێنێ ٠

ئەمەیە بیرو باوەڕی مەولەویی : بە درێژاییی لەگەڵ ئەشعەریدایە تەنانەت شێخ ئەبومە نصووری ماتوریدیی کە بمهاو شانی ئەشـعەریی بۆ برەو پێدانی سوننەت ( السُنّة ) ئـەدرێتە قەڵەم مەولـەویی لێی جیـا ئەبێتەوە لێرەداو ئەڵێ :

**أشعرت الى الأشعرى الوحيد**

**قلبى ما تريد نحو ما تريد(٢٣٠)**

هەستو نەستم لەگەڵ ئەشعەریی تاقانەدایەو دڵم لای ( ماوریدی ) ناوێ ، مەبەستی لێرەدا مەسەلەی ئیرادەی جوزیئیە کە مەولانا خالید لـە نامیلکەیەکدا بـە جوانیی ڕوونی کردووەتەوە .

ئەنجا مەولەویی ئەکەوێتە دەمەتەقێ لـە گەڵ ئەو تاوانبارانەدا کـە چارە نووس ئەکەن بـە بیانوو ، لەمەوە ئەیانەوێ بۆ سـنوور شـکاندنی ئاین دەرفەتێ دروست کەن ؛ گوایە تاوانبار چونکە تاوانەکەی لەزانینی خودادا جێگیر بووە ئیتر ئەو هیچ دەسەڵاتێکی نامێنێو هەر ئـەبێ ئـەو تاوانە بکات .

هەندێ شاعیریش لەم ڕووەوە دوواون کە نموونەی هەرە بەرزیان خەییامە کە ئەڵێ :

---

(٢٣٠) اشعرت الى الأشعرى الوحيـد : هەستم بـە لای ئەشعەریی تاقانەدایە .

قلبى ما تريد نحو ما تريد : دڵم لای ( ما تريد )ی ناوێ ، ( ماتريد )ی یەکەم عەرەبییە واتە نایەوێ دووەم ناوی مەحەللەیەکە لە سەمەرقەند کە شێخ ئەبومە نصووری بۆ نیسبەت دەدرێ . لـە بەتیەکـەدا جیناس هەیە .

مەی خۆرەکان دەوەرن سازدەیێ کۆڕێ
مەیگێڕ وەرە با دەفری شەراب هەڵچۆڕێ

دەیزانی خودا ڕۆژی بەرێ ، مەیخۆربین
تێکی مەدە زانستی خودا ناگۆڕێ ٠

مەولەوییش بەم جۆرە لەگەڵیان ئەدوێ :

ئەو وەختەی کە خۆت ئەگوناه دەخەی
لەوێودواییچ تا ، تەوبەی لێ دەکەی

جەوازی نییە هـەم مەینێرە ســەر
ئیحتیجاج کردن بــە قەضاو قــەدەر(۲۳۱)

( سبق في العلم ) بووەو دەســم برد
( کتب في اللوح ) منیچ بۆ وەم کرد(۲۳۲)

کە تاوانت کرد تا پەشیمان بوونەوە ، تاوانی بڕوبیانوو هێنانــەوەی
بە چارە نووس مەخەرە سەر، بەم ڕەنگە بڵێی : خودا لە پێشدا گوناهەکەی

(۲۳۱) جەوازی نییە : دروست نییە ٠ ئیحتیجاج ( احتجاج ) : بەڵگــە هێنانەوە ٠ بیانوو هێنانەوە ٠

(۲۳۲) سبق في العلم : لە عیلمو زانیینی خودادا تێپەڕیبوو ٠ بووەو دەسم برد : پێش کەوتنەکە بووەو منییش دەستم برد بۆ تاوانەکە ٠ کتب في اللوح : لە ( لوح المحفوظ )دا نووسرابوو ٠ منییچ بۆ وەم کرد : منییش بۆیە وام کرد ٠

منی زانیوو ، ئەبوایە هـەر بم کـردایـە یا بلێی : ( لـوح المحفوظ )دا نووسرابوو ، ئەبوایە هەر بهاتایەدی‌ی‌و منیش لەبەر ئەمانـە دەستم دایـە تاوان‌و گوناه ، مەولەوییش بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە :ـ

**دەفتەری عیلم‌و لەوحت لەبەر بوو ؟**
**غەمت هەر جەهلی صاحێب دەفتەر بوو ؟(٢٣٣)**

**گرفتـار نـەفسی ئەممـارەی خۆتی‌ی**
**شەڵوپەت دەکەی هەی شێتی پەتی‌ی(٢٣٤)**

نە برا واتیە ، خۆ دەفتەری زانیاری‌ی‌و لەوحی خودات لەبەر نەبوو تـا خەمی نەزانی‌ی خاوەن دەفتەرەکە بخۆی‌و دەست بدیتـە تاوان‌و بڵێی بۆیـە تاوانەکەم کرد لەبەر ئەوە نەوەك خودا پەنا بەو ـ نەزانی‌ی‌و کەم‌و کووڕی‌ی بەسەردا بێ ٠

نەخەیر ئەوە نیە بەڵکو گیرۆدەی نەفسی بە گونـاه فەرمـاندەری خۆتی‌و لەتاو ئارەزووی پەست کەوتوویتە وڕێنەو وتەی بێجا ، هەی شێتی پەتی‌ی !

جا ئەگەر دوای ڕوودانی تاوان ، دانت تاوانباریتدا تـاو ویستت تۆبەی لێ بکەی ئەوە قەید ناکات ئەگەر شـێوازی ئـەدەب بگریت وەك باپیرە گەورەت :

---

(٢٣٣) جەهل ( جهل ) : نەزانی‌ی ، نەزانیین ٠
(٢٣٤) گرفتار : گیرۆدە ، دووچـار ٠ نەفسی ئەممـارە : نەفـسی فەرماندەر بە خراپە ٠ لە ئایەتی : ( ان النفس لأمارة بالسوء الا ما رحم ربی )یەوە وەرگیراوە ٠
شەڵو پەت دەکەی : کاری خێچ‌و خوار دەکەی ٠

جاییزە بەعدەز تەوبە بدەی دەم
ئەمما بە ئەدەب هەر وەکوو ئادەم(٢٣٥)

ئا بەم جۆرە ناسك‌و دڵگیرە وردە وردە مەولەویی باسەکەی ڕاکێشا بۆ مەسەلەی تەوبە کردن‌و بە بۆنەی ئەویشەوە بۆ باسی سەرەمەرگ‌و نیازیشی ئەوەیە کۆتاییی بنەڕەتی شەشەم‌و کۆتاییی هۆنراوەکە لەگەڵ کۆتاییی ژیاندا یەك‌خات لەم کۆتاییە دڵگیرەدا :ـ

زانینی ئەووەل ئەدەس ناکەوێ
بە نەفەس ئاگات لە خاتیمە وێ(٢٣٦)

زانینی کۆتاییی ژیان لە سەرەتاوە بۆ کەس دەست نادا ؟ کە وابوو هەناسە بە هەناسە ئاگات لێی بێ‌و کاری وات لە دەست دەرنەچێ‌و بیرو باوەڕی وات لە مێشکدا جێ گیر نەبێ پاشە ڕۆژی ژیانت ڕەش کات . جا باش گوێ بگرە پێت بڵێم چیی ئەکەی :ـ

---

(٢٣٥) جاییز ( جائز ) : دروست . بەعدەز بنەڕەتەکە (بەعد ئەز)ە لە واتادا ئەم دوو شە لێك ئەپچڕێن ، ئەز لە واتەدا بەستەیە بە ( بدەی )ەوە نەك بە بەعدەوە واتە : دروست پاش گوناە ، دەم لە تۆبە بدەی وەکو ئادەم . ئەمما ( أما ) بەڵام . ئەدەب ( أدب ) : ڕێز . ئادەم ( آدم ) : باوکی هەموو مرۆڤان ، یا مرۆڤ خۆی وەکو ئەوەی ئەڵێن ئادەمانە ئەوشتەی کرد لەبەر ئەوە ناسکییەکی دڵگیری تێدایە .

(٢٣٦) ئەووەل : لە پێشەوە ، ئاوە ئکرداری زانینە نەك ئەسەر خراو : (مضاف الیه) . نەفەس : هەناسە . خاتیمە ( خاتمە ) : پاشەکیی ، سەرە مەرگ ، کۆتاییی ژیانی ئادەمیزاد ، ناوکۆییە لە نێوان ( زانینی )و ( ئاگات )دا .

**ظاهیــری شەرعی‌ی بگــرە نەگــەردن**
**تا ئەم مردن تێ یاخۆ ئــەو مردن(٢٣٧)**

فەرمانە سەرزارەکییەکانی ئایینی ئیسلام بگرە ئەستۆت‌و لەسەریان برۆ تا نەفسی بەد خووت ئەمرێ‌و دڵت بە نووری خودا ڕوونا‌ك ئەبێتەوە ، ئەو کاتە لەگەڵ پەرستنە سەرزارەکییەکە پەرستنی دڵــی‌ی‌و بیریشت بۆ پەیدا ئەبێ‌و خۆت ئەو دەمە بە ڕووناکی‌ی چرای دڵت ڕێ‌و شـوێن دەر ئەکەی‌و پێویستت بە کەس نییەو ئەگەر بەم پایە نەگەیشتی‌ی ئەزا ئەبـێ تا مردنی ئاسایی‌ی بەردەوام بی ، هەر چەند ڕەوشتی خودا وا هاتوە : بە پێی ئامادەیی‌ی خۆی کەس بێ بەش نەبێت بەم جۆرەی کە دێت :

**چون بەو ظاهیرە دڵ نوورانی‌ی بوو**
**پەردەی ظوڵمانی‌ی لە ڕووی دڵ لاچوو(٢٣٨)**

**باطینی شــــەرعییت تێ وە پیـــرەزە**
**بــەم تەقرییرەوە بــەم تەحــرییرەوە(٢٣٩)**

---

(٢٣٧) ظاهری شەرعی‌ی : دیبوی دەرەوەی شــەرع ، ئــەوەی ئایینی ئیسلام فەرمانت پێ دەدا ، وە‌ك ، نوێژ ، ڕۆژوو ، ڕاست گۆیی‌ی ، تاد ٠٠٠ تا ئەم مردن تاد ٠٠٠ : هێمایە بۆ فەرمووەی ( موتوا قبل أن تموتوا ) : واتە : پێش ئەوەی مردنی سروشتی‌ی‌تان بــە سەردا بێ نەفسی خۆتان بمرێنن ، بە وەرزشی گیانی‌ی‌و خودا پەرستی‌ی ٠

(٢٣٨) چون : کە ٠ نوورانی‌ی : ڕووناك ٠ ظوڵمانی‌ی : تاریك ٠

(٢٣٩) باطین ( باطن ) : دیبوی ناوەوەی ، نهێنی‌ی ٠ تەقرییر (تقریر) : دارشتن ، ئەو ڕوون کردنەوەی مامۆستا بۆ قوتابی‌ی ئــەڵێ ٠

که به گوێڕایەڵی سەرزارەکیەکانی ئایین دڵت ڕووناک بووەوەو پەردەی تاریکی گوناەو ئارەزوو لەسەری لاچوو ئیتر نهێنیەکانی ئاینت دێ بە پیردەوە بە پێی ئەم وتارو نووسیە :-

دەڵێ : تاقاضای ظاهیر بوو ئەمە
ئەم نیزاعە ، ئەم هەموو هەمهەمە(٢٤٠)

یەکێ جەبری بوو یەکێ قەدەری
یەکێ تابیعی ڕەئیی ئەشعەری(٢٤١)

یەکێ لە دەسی تەوارود غەمناک
یەکێ خەریکی دەردی ئیشتیراک(٢٤٢) ، (٢٤٣)

---

تەحریر ( تحریر ) : نووسین ، دەرخستنی مەبەست لەم کاتەدا ناوە تەواوەکەی ( تحریر المراد )ە ·

(٢٤٠) تەقاضا : ویست ، دیاردە · نیزاع ( نزاع ) : کێشە ، نێک چوون ، خیلاف · هەمهەمە : قرەوبرە ، وتاری زۆر ·

(٢٤١) جەبری ( جبری ) : ئەوەی مرۆڤ بەزۆر لێ‌کراو دائەنێ ، وەك جەهەمییەکان :- دواکەوتووانی جەهەمی کوڕی صەفوان · قەدەری ( قدری ) : نیسبەتە بۆ قەدەر ( قدر ) : چارەنووس ، مەبەست لێرەدا موعتەزیلەکانە ، بە جەهەمییەکانییش هەر دەڵێن قەدەری هەریەك بە بارێ · تابیع ( تابع ) : دوا کەوتوو ·

(٢٤٢) تەوارود ( توارد ) : زاراوەیەکی فەلسەفەو کەلامە مەبەست : داهاتنەوەی دوو کارایە ( عامل ) بۆ دروست کردنی یەك کار ، مەبەستی بیرو ڕای ئوستاد ئەبوو ئیسحاقی ئەسفەراییینییە کە ئەفەرموێ : تواناو ویستی خوداو بەندە هەردووکیان کاری بدندە دروست ئەکەن · غەمناك : چونکە بەندەی کرد بە هاوەڵ بۆ خودا ·

ڕاسته زانستی سەرزارەکی‌ی بوو ئەم هەموو ئیرەوکێشەی لە بیرو باوەڕی موسوڵمانانندا دروست کرد، بە نایبەت لە مەسەلەی چارە نووسدا :ـ ئەوەتـە هـەندێ وتی : مرۆڤ زۆڵێـکراوە ( جەهەمی‌ی ، جەبری‌ی )و هەندێکیش وتی : خاوەن دەسەڵاتەو چارەنووسـی بە دەسـت خۆیەتی : ( موعتەزیلە ) ، هەندێکی تریش دوای بیرو باوەڕی شێخی ئەشعەری‌ی کەوتن کە ڕێبازێکی ناوەندی لە نێوان هەردوو ڕاکەدا هەڵبژاردووە • هەندێکیش خەم‌و پەژارە دای گرتوون چۆن توانای خوداو بەندەیان بـە جووت بەردواتە یەك کار ؟ وەکو خودا بـە تەنیا نەتوانێ بەوکارە هەستێ: ( ئەبوو ئیسحاقی ئەسفەرایینی‌ی ) ، هەندێکی کەیش سەرفاڵ‌و خەریکی دەردو دووی بەشدار کردنی یەك کارن لـە نێوان دوو کارا (عامل ، علة)دا هەر یەك بە شێوەیەك : خودا بە دروست کردن‌و بەندە بـە کـردنی بـە گوێڕایەڵی‌ی یا سەرپێچی‌ی : ( قازی‌ی ئەبوو بەکـری باقیلانـی‌ی ) ، بەڵـێ ڕێی مەڵـگەیی‌ی‌و زانسـتی سـەرزارەکی‌ی ئـەم بیرو بـاوەڕە هەمەچەشنانەی لێ‌دەوەشێتەوە چونکە ڕێبازەکانیان بەم جۆرەیە :

**کۆلانی چاو ڕەنگ ، تەشاوی داڕەنگ**
**جێی پەستو بوڵەند ، خارو دارو سەنگ(٢٤٤)**

---

(٢٤٣) ئیشتراك ( اشتراك ) : مەبەستی لێرەدا قازی‌ی ئەبووبەکری باقیلانییە کە ئەڵێ : خودا کردارەکە دروست ئەکاو بەندەیش ئەی‌کا بە گوێڕایەڵی‌ی یا سەرپێچی‌ی کە وابوو کارەکە بەشکراوە لە نێوان هەردووکیاندا هەر یەکە بە شێوەیەك تیبینی تی دەکات •

(٢٤٤) تەشاو : شێیوە لۆك ، لە دوو شوێندا بە واتای شەپۆل بەکاری هێناوە • بوڵەند : بەرز • خار : دڕك • سەنگ : بەرد ئەم وشانەی بـە شێوەی خوازە بەکار هێناوە ( استعارة ) ، ڕاڤـەی بەیتەکە مەبەستەکانیان ڕوون ئەکاتەوە •

کۆلانی تەسك و تروسك کە بیروڕا تێیدا بە ئازادیی هاتوچۆ ناکەن و لە یەکتر ئەدەن ، شیوەلۆکی بێ دەرەتان کە شەپۆلی بیر بە باشیی ناکێشێ ، شوێنی تێجگار پەست و نزم کە بە هیچ جۆرێ ناگاتە ئاسۆی مەبەست ، یا ئەوەندە بەرزو بالا کە فڕیی بە سەریەوە نامێنێ ، ڕێگەی بەردەلان و پڕ کۆتەرەدارو دڕك ، کە سەرپەنجەی بەلگەی لێ هەلئەکەوێ یا دڕکاژن دەبێ و پەکی ئەکەوێ و ناگاتە ئامانج • ئەمە باری ڕێبازو ئەمەش دۆخی ڕێبوارەکە :

## نێلەی عەوامیل لـــە ملییدا چوست هێش و مشانی نەوع‌نەوعی لێ خست(٢٤٥)

نێلەی هۆ : ( نظریة السبب ) لـە ملیدا توند بوو بوو ، ئەیویست دەر لەو ڕێبازەوە بگاتە ڕاستیی ، لەبەر ئەوە هەر جارێ جۆرە هەوجاڕو مژانێکی لێ ئەبەست ، بە نیازی وەرد دانەوەی زەویی مێشك و چاندنی باوەڕی دەست‌کەوتوو بۆ بەرهەم هێنانی باوەڕی باشترو بەسودترو لـەم کاتـەدا :ـ

## صەدای سەماعیی و قیاسیی لە گوێ نەقیزەی نەقیض مەطلەب دەیدا لێ(٢٤٦)

(٢٤٥) نێلـە : نیر ، ئەوەی لـە ملی گاجـووت ئەخرێ • عەوامیـل ( عوامل ) : کۆی عامیلە ( عامل ) : زاراوەیەکی نەحوە مەبەست لێرەدا هۆیە ( سبب ، علة ) • چوست : توند • هێش : هەوجاڕ ، هێرەق • مشان : مژان • نەوع‌نەوع : جۆرجۆر • لێ خست : لێ بەست •

(٢٤٦) صەدا ( صدی ) : هاوار ، دەنگ ، دەنگ دانەوە • سەماعیی و

هەر دەنگی سەماعیی و قیاسیی ئەهاتە گوێی کـە هەر دووکیـان هۆی سەرزارە کین(٢٤٧) و فڕیان بـە مەبەستەوە نیە لەگەڵ ئەوەشدا هـەرکانێ بـەرەو مـەبەستی ڕاست بڕۆیشـتایـە وەهـم نـەقیزدی بۆ دائەوەشاندەوەو ئەی خستەوە سەر دژی ئەو مەبەسـتەی کە لـە بەڵگەوە بۆی دەرکەوتبوو ، بەڵی لەبەر ئەوە :ـ

**لـــە هێلی لەفظی هـــۆی نەدەداوە**
**مەعنەویی بە حاڵ دوو بوو بە لاوە(٢٤٨)**

---

قیاسیی : ( السماعی والقیاسی ) : دوو زاراوەی نەحوون یەکەم ئەو عامیلەیە هەتا لە عەرەب نەبیستری ئەو ئیشە تایبەتەی پێ ناکرێ وەك حەرفی جەڕ کە بیستن و یەك یەك بیستراون ئیشی جەڕ ئەکەن دووەم ئەوەیە بە پێی یاسا ئیش دەکات وەك فیعل ، چونکە هەموو فیعلێ فاعیل مەرفووع دەکات · نەقییزە : دارێکی درێژی نووك تیژە جووتیار گاجووتی پێ ئێنەخوڕێ · نـەقییض ( نقیض ) : دژ ، زاراوەیـەکی مەنتیقـە ، مەبـەست داڕنراوی ڕستەیەکە ( سلب قضیة ) بە جۆرێ کە هەر یەکێکیان ڕووبدات ، وەك بەندە زۆرلێکراوە ، نەقیضەکەی بەندە زۆرلێکراو نییە · مەطلەب ( مطلب ) : مەبەست ، ئەوەی بتەوێ بە بەڵگە بیسەلمێنی ، داواکراو ·

(٢٤٧) لەوە ئەچێ مەبەستی لەم دوو جۆرە بەڵگەی سەمعیی : ( ئەوەی لە قوئان و فەرمودە وەردەگیرێ )و بەڵگەی فەلسەفیی و کەلامیی بێ ، خۆت بەراووردو تەتەڵەی کـە ، مەولەویی نەی ویبیستووە تەنانەت ئەوەندەشی لێ دەرکەوێ ·

(٢٤٨) لەفظیی ( لفظی ) : بێژەیی ، ئەو عامیلەیە لە بێژەدا دەربکەوێ وەك حەرفی جەڕ ، فیعل ، هتد سەماعیی و قیاسیی بەشی ئـەم جۆرەن · مەعنەویی ( معنوی ) : واتایی ، ئەو عامیلەیە کـە

هەر بەردوام بوو لەو هێڵە زاریەیدا گرتبووی کە هێڵی بیستراویی و یاساییەو هەر بە خەیاڵیدا نە ئەهات هۆ بداتەوە وەك جووتیاری ڕاستەقینە، لەبەر ئەوە هەر چەند سەرزارەکیی دانی پێدا نەئەنا بەڵام بەزمانی حاڵ هۆی واتایی ( العامل المعنوي ) بەلاوە دوو بووو نەگەیشتبوە ئەو پایەی کـە دەرکی ئەوە بکات کە هەر یەکە : (خودا)

بەڵێ خۆی لـە پێستی خۆیدا بەم جۆرە بوو لای کەسـانی تریش چەشنێکی تر :ـ

لـە لای باخەبەر نافیص ، بێخەبەر
تەواو بو ، ماوە ثـەقیل و مونکـەر(۲٤۹)

---

هـەرگیز دەرنا کـەوێ ، وەك عامیلی موبتـەداو خەبـەرو فیعلی موضاریع ، لە زانیاریی نەحودا ئەم دوو جۆرەی هەیە بەحال : دۆخ ، بار ٠ دوو بوو بە لاوە : لە نەحودا دۆجۆرە وەك باسمان کرد بەلام لەڕاستییدا وەکوو ئەهلی دڵ بۆیان دەرکەوتووە هەر ئەبێ یەك بێ کە خودایە ٠

(۲٤۹) باخەبەر : ئاگادار ، هۆشیار ٠ نافیص ( ناقص ) : ناتەواو ، زاراوەیەکی نەحوە مەبەست ئەو فیعلەیە کە پێویستی بە خەبەر هەیە ، لێرەدا تەناسوبێکی جوان هەیە ٠
تەواو : هێمایە بۆ فیعلی ( تام ) : ئەوەی پێویستی هەر بە فاعیل هەیەو بەس ، خەبەری ناوێ ، لێرەشدا هەر تەناسوب هـەیە ٠ ثەقیل ( ثقیـل ) : قورس ، زاراوەیەکی نەحوو صەرفە : ئـەو وتەی قورس بێ لەسەر زمان ، لێرەدا مەبەست قورسیی بە باری زانیاریی زارییەو ، هێمایشـە بۆ قورسبوونی ئیسـم پێش ئیضافـە بە هۆی تەنوینەوە ٠ مونکـەر ( منکـر ) : نەناسراو زاراوەیەکی نەحوە مەبەست ئیسمێکە بۆ چەند شتێ دەست بدات لێرەدا لەگەڵ هێما بۆ ئـەم واتایە مەبەست نەناسراوییە لای ئەهلی دڵ ٠

لای هۆشمەندەکان ناتەواو بوو ؛ چونکە ئەیان زانیی سەرمایەکەی زانیاریی سەرزارەکییەو ئەویش هەر چەند فراوان بێ کەڵکی تەواو نادات ٠

لای بێ ئاگاکانیش تەواو بوو ؛ چونکە وایان دەزانی تەواویی لەو قوولەقوولو بگرەوبەردەدایە ، ئا بەم جۆرە مایەوە : قورس ، لە ژێر باری زانستیی سەرزارەکییداو ، نەناسراو لەناو ئەهلی دڵو زانا ڕاستەقینەکاندا :

**تا وەختێ کەلام صوحبەتەکەی شێخ**
**ئیضافەی مەعنای هیممەتەکەی شێخ(٢٥٠)**

**دای پێی نائیدەی تەخفیفو تەعریف**
**طەیکرد ڕێگەی حەق پێی چلۆن ظەریف(٢٥١)**

تا کاتی بەڵێن دانی هاوەڵیی شێخو دەست پێوە گرتنی ، لەو دەمەدا

---

(٢٥٠) کەلام ( کلام ) : وتە ، مەبەست یا بەڵێن دانی مەولەوییە یا وەرگرتنی شێخە ٠
صوحبەت ( صحبة ) : هاوەڵیی ، لە خزمەتدا بوون ٠ ئیضافەی مەعنای هیممەتەکەی شێخ : خستنە پاڵی واتای یارمەتیی شێخ ٠

(٢٥١) فائیدة ( فائدة ) : سوود ٠ تەخفیف ( تخفيف ) سۆوك کردن ، ڕوو ئەکاتە وشەی ( ئەقییل ) لە بەیتی پێشوودا ، بەپێی زانیاریی نەحو ناو ئیضافەت کرد تەنوینەکەی لائەچێو سووك ئەبێت ٠ تەعریف ( تعريف ) : ناساندن ، ڕوو ئەکاتە وشەی ( مونکەر ) ، بە پێی زانیاریی نەحو ئیسم ئیضافەت کرد تەعریف وەر دەگرێ لە موضافو ئیلەیهی ، مەبەستەکەی مەولەویی لەڕاقەی سەرەوەدا ڕوون کراوەتەوە ٠ ظەریف : جوان ، خاوێن ، چاك ٠

چوونە سەرێی واتاو مانای یارمەتی‌ی شێخو دوو سوودی سووکباری‌ی
ناسراوی‌ی دایەو ڕێی حەقو ڕەوای زۆر بەجوانی بێ بڕی‌ی .

لێرەدا مەولەوی‌ی کۆتایی‌ی بە گەشتە ڕەوانییەکەی خۆی دێنێو لە ڕاستیشدا گەشتی هەموو زانایە‌ی سەرزارەکییە کە دلی بەو زانستە ئاو نەخوانەوەو عەودالی ئاوی ساردو ڕەوانی گەلە تەزێنی ڕاستەقینە بێ تا لە کۆتایی‌ی گەشتەکەیدا لە ڕێبازی وەرزشی گیانی‌ی و سۆفیگەرییەوە دەستی کەوتبێو لە هەموو کێشەیەك پێی ڕزگار بووبێ . ئەنجا باسی هەندێ ئەو مەبەستانە دەکات کە پاش ڕێ بڕینەکە بۆی ڕوون بووەتەوەو ئەلێ :-

( قیل لە انظر من أعلى الدرج
( لقاع صفصف ) بێ ئەمتو عیوەج(٢٥٢)

لە ( کنت کنزا مخفیا ) نیشان
( فأحببت أن اعرف ) چاك بزان(٢٥٣)

---

(٢٥٢) قیل لە - صفصف : پێی گوترا لە سەرووی پەیژەکەوە سەیری دەشتی ڕاخراو بکە ، کە نەکۆسپ نەخواری‌ی تێدایە . اعلى الدرج : سەرووی پەیژە . قاع : زەوی‌ی . صفصف : ڕێك . أمت : کۆسپ . عیوەج ( عوج ) : خواری‌ی .

(٢٥٣) لە کنت تاد ... : ئەمە فەرموودەیەکی قودسییە مەولەوی‌ی لێرەدا ناوەندی کردووەو دەقەکەی ئەمەیە : ( کنت کنزا مخفیا فأحببت ان اعرف فخلقت الخلق لکی اعرف ) واتە : گەنجینەیەکی شاراوە بووم پێم خۆش‌بوو بناسرێم خەلکم دروست کرد بۆ ئەوەی بناسرێم لەمەوە دەر ئەکەوێ مەولەوی‌ی هەموو فەرموودەکەی بێ دەست کاری‌ی هێناوە لەگەل ڕاقەدا .

**فخلقت الخلق ) بۆچ ؟ ( لكي أعرف )**
**( فاءرف [ الغـائب ] وقل لا تخف )(٢٥٤)**

پێی گوترا : ئێستە لـە سەرەوە تەماشای دەشـتی ڕێکوپێکو بـێ کۆسپو خواریی بکە ، ئەو سابۆت دەر ئەکەوێ کە ئەو هەموو تەنگو چەڵەمەو کۆسپانەی هاتە ڕێت هی‌ی ئەوە بوو ڕوانـگە کەت پەسـت بووو بەری چاوت گیرابوو ، ئێستە سەرەدەمی ئـەوە هاتووە لـە فـەرموودەی خوداوە : ( گەنجینەیەکی شاراوە بووم ) نیشـانی ئەوە بگری‌ی کـە پێی خۆشە بناسرێ ، کە ئەوەشت زانی ، نهێنی دروست کـردنی کە سانت بۆ دەر ئەکەوێ ، کە هەر ناسینی خودایە ، کەوابوو شاراوەی ئەزەل بناسەو بەکەسانی تریشی بناسەو بڵێو مەترسە :ـ

**ئەگەرچی مەحبووب ، پاك پەردەیی غەیب**
**دامەنەی بێگەرد لە توهمەتو عەیب(٢٥٥)**

**( في كماليـــــه بالغنـــــى مقـــرون**
**عمـــا قـــد وجـــد وعمـا يكـون )(٢٥٦)**

---

(٢٥٤) **فاعرف‌الغائب وقل لاتخف** : ونو شاراوەکە بناسەو بڵێو مەترسە، هێمایە بۆ ئایەتی : ( لا تخف انك أنت الاعلى ) کەخودا بەمووسای فەرموو . [ الغاب ] : لە خەتو چاپەکەشدا النائب بوو بەڵام لێرەدا باش ناگونجێو لەیەکییش نزیکن لەبەرئەوە بەو جۆرەمان‌لێکرد ئەگەر وییستییشت هەر نـەی گۆڕی مەبەست لـە نائیب شێخی تەریقەیە کە سەبارەت بەم شوێنە شێخ‌وەسمانە لە لەمەو پێش باس‌کراوە . گوتراوەکە : ( ئەگەر چی ... تاد ) رەچاو کەو ئینجا خۆت سەر پشك‌بە .

(٢٥٥) مەحبووب ( محبوب ) : خۆشە وییست مەبەستی خودایە . پاك : خاوێن لە کەمو کووڕی‌ی . پەردەیی غەیب : پەردەی شاراوەیی‌ی . دامەنە : داوێن . توهمەت ( تهمة ) : گومانی خراپ .

(٢٥٦) في كماليه : لە هەردوو تەواوییدا : تەواوی‌ی زاتو تەواوی‌ی

ئاوێنەی بچووك تەنگی كەونییە
ئاوێنەی بالانمای ئەو نییە(٢٥٧)

شانەی تەفاصیل عەینی‌ی كائینات
داو داوو تا تای زلفی ئەو نادات(٢٥٨)

خوصووص ئاوێنە ئەغلەب بۆ عەیبە
چ عەیبێ لە لای ( عالم الغیب )ە ؟!(٢٥٩)

طوغرای خود بە خود ئازاییش دادە
بە ئەندازەی حوسنی ئەزەل ئامادە(٢٦٠)

---

سیفات بالغنی مقرون : هاوەڵە لەگەڵ پێنەویستییدا ٠ عما قد
وجد : لەوەی كە بووە ٠ وعما یكون : لەوەی كە لەمەولا دەبێ ٠

(٢٥٧) ئاوێنە : ئاوێنە ٠ كەونی‌ی ( كونی ) : نیسبەتە بۆ كەون ( كون ) : گێتی ، بوونەوەر ، جیهان ٠ بالا نما : ئاوێنەیەك سەرتاپای بەرانبەرەكەی دەربخات ٠

(٢٥٨) تەفاصیل ( تفاصیل ) : كۆی تەفصیلە ( تفصیل ) : درێژەی شت ، مەبەست لێرەدا دانەدانەی بوونەوەرە ٠ عەینی‌ی ( عینی ) : نیسبەتە بۆ عەین ( عین ) : ئەوەی خۆی بەخۆیەوە وەستاوە ، ماددە ، ئەوەی عەرەض نییە ٠ كائینات ( كائنات ) : كۆی كائینەت ( كائنة )ە : بوونەوەر ، دروست كراو ٠ داو : تاو ٠ داوداوو تاتای زلفی ئەو نادات : واتە هەموو تاوەكانی زلفی ئەو داناهێنێ ٠

(٢٥٩) خوصووص ( خصوص ) : بە تایبەتی‌ی ٠ ئەغلەب ( أغلب ) : بە زۆری‌ی ٠ عالم الغیب : ئەوەی زانستی شتی لە ئێمە شاراوەی هەیە ، دیارە كە هەر خودایەو بەس ٠

(٢٦٠) طوغرا : طوڕڕە ، مووی سەر كلاڵە بكرێو لوول بدرێ ٠ خود

گرنجو شــکنج پێــچ لەســەر خــۆی
کەی ڕێکەوت تەرتیب طیبب ڕەیو کەی(٢٦١)

چ ئیحتیاجی هــەیە بــە شــانە
( ســـبحانه مـا أعظـــم شـــانه )(٢٦٢)

بــەڵێ موختارە ئــەر خەڵوەتی بوو
موتەفــەضیلە ئــەر جــەلوەتی بوو(٢٦٣)

---

بە خود : خۆ بە خۆ ، بێ یارمەتیی کەس یاشتی تر • ئارایيش : ڕازاندنەوە • دادە : داوێنی • حوسن ( حسن ) : جوانیی • ئەزەل ( أزل ) : ماوەی پێش کات ، بێ سەرەتاییی •

(٢٦١) گرنج : چاڵو چۆڵو بەرزو نزم • شکنج : شکاو • پێچ پێچ : خاوەن هێڵی خێچو خوار بە هۆی ناپاکیی کەرەسەی ئاوێنەکەوە • لەسەر خۆی : بەستەیە بە (پێچ پێچ)ەوە یا بە (کەی ڕێکەوت)ەوە لە مەسرەعی دووەمدا ، ئەش بێ ناوکۆییی بێ لە نێو هەردووکیاندا• تەرتیبب ( ترتیب ) : دانانی هەر شتێ لە شوێنی ڕەواو تایبەتی خویدا • طیبب ( طیب ) : بۆنی خوش ، خاوێنیی ، لەوەئــەچێ لێرەدا مەبەست ئارایيش بێ بــە شیوەیــەکی گشتیی • ڕەی ( ری ) : شارێکی کۆنی ئێرانە کەوتووەتە باشووری ڕۆژهەلاتی تارانەوە •

کەی : سەرەتای ناوی گەلێ لە پاشا بەناوبانگەکانی کۆنە ، وەکو ، کەیومرث ، کــەیقوباد ، کــەیکاوس ••• ، مەبــەست لە طیببی ڕەیو کــەی لێرەدا بــە شیوەی ڕەمزو خــوازە ، خــاوێنییو بۆنخۆشییو جوانکاریی بارەگای قودسیو پەروەدگاری گەوریە • لە چاپەکەدا لە باتیی ( طیب ) ، ( طیپ ) دانراوە کە وابزانم هەڵەی چاپە •

(٢٦٢) سبحانه ما اعظم شانه : ئای لە خاوێنییو لە گەورەبیی شانو شکۆی ! •

(٢٦٣) موختــار ( مختــار ) : ئەوەی بە ئارەزووی خۆی بتوانێ فرمان

ئەگەرچی خۆشەویستی خاوێنی ئەو دیو پەردەی شاراوەیی‌ی : ( غیب ) داوێنی لە تەپو تۆزی گومانی خراپو ناتەواوی خاوێنەو لە هەردوو تەواوییەکانی زاتو سیفاتدا پێویستی بە هیچ شتێ نیە نە ئەوەی کە بووەو نە ئەوەشی کە لەمەولا ئەبێت •

هیچ شتێك ناتوانێ مافی خۆی بداتێ لە نوواندنو ڕوون کردنەوەدا بانگەوازی گەورەیی‌یو دەسەڵاتو هەمووتەواوییەکی بۆ ئەکەن بەڵام ؛ چونکە ئەوەی پێیدا ڕادەپەرمووی ، هەستێ بەم کارە گەردوونو زنجیرەی بوونەوەرن ؛ کە پڕ بە دەم هاواری زانایی‌یو ژیری‌یو لەگەڵ ئەوەشدا دەستیان هێشتا لە ئەنجامدانی ئەمکارەدا هەرکورتە ؛ چونکە هەرچەند گەردوون : ( کَوْن ) لەم کارەدا بۆ دەرخستنی تەواوییەکانی خودا وەك ئاوێنە وایە بەڵام بێ‌گومان ئاوێنەیەکی تەسكو

---

بکات ، زۆر لێ نەکراو • ئەر : ئەگەر • خەڵوەت ( خلوة ) : خۆ دەر نەخستن • موتەفەضضیل ( متفضل ) : خاوەن گەورەیی‌یو بەخشش • جەلوەت ( جلوة ) : خۆ دەرخستن •

مەولەوی‌ی لێرەدا شێوازێکی گەلێ ناسكو دلگیری بەکار هێناوە لە پێچانەوەو کردنەوەی ڕیزداردا ( اللف والنشر المرتب ) ؛ سێ بەیتی : ( ئاییتەی بچوك ) ، ( خوصووص ئایینە ٠٠٠ ) ، ( گرنجو شکنج ٠٠٠ ) لە واتادا پەیوەندن بە یەکەوە سێ بەیتی : ( شانەی تەفاصییل ) ، ( طرغرای خود ٠٠٠ ) ، ( چ ئیحتیاجی ٠٠٠ )یش بەستەن بە یەکەوە ، دووبەیتی پێشوو ( ئەگەرچی ٠٠٠ ) ، ( في کمالیە ٠٠٠ ) وە دوواترین بەیتییش ( بەلی موختارە ٠٠٠ ) هەر دوو دەستەکە : دەستەی ئاوێنەو ، دەستەی شانە ئەبەستێ بە یەکەوە ، لام وایە ئەمە هونەرێکی تایبەتییەو دانانی لەژێر سەرناوی پێشەوەدا بۆ ڕوون کردنەوەیە ، سەیری ڕاڤەکەی سەرەوەکە ، لەوێدا هەردوو دەستەکە لێك جیا کراونەتەوە •

کورتەو باڵانما نیە تا هەموو لایەنێکی ئەو دەرخات ، بە تایبەتی‌ی ئاوێنە بۆ چاك کردنی کەم‌و کوڕی‌ی بەکار دێنرێ‌و خوداش دوورە لــە هەموو شتێکی وەها ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئاوێنە چاڵ‌و چۆڵ‌و ، شکاوو پێچ پێچە ، کە دیمەن خێچ‌و خووارو ناشیرین دەکات چۆن ئەشێ ئارایشـــی لەبەر بکرێ‌و سەروڕووی لەبەر تەرتیب بدرێ • ( سەیرێکی ڕافەی وشەکان کەرەوە ) • ئەمە بارو دۆخی ئاوێنەی گەردوون •

شانەی دانە دانەی بوونەوەریش هیچ کاتێ ناتوانێ تاڵ تاڵی زلفی ئەو دابێنێ ، ئەو خۆی بـــە خـــۆی توڕڕەی ئارایش داوەو بە ئەنـــدازەی جوانی‌ی بێ پایانی هەر لــە ئەزەلدا ئامادە بووە •

جا ئیتر چ پێویستی بە شانە ، هەیە ؟ ، ئای چەند پاك‌و بێ‌خەو ئەو چەندە گەورەو مەزنە !!! •

ئەمە بارودۆخی گـــەردوون‌و زنجیرەکانی بوونـــەوەر بـــەرانبەر بەجوانی‌ی‌و تەواوی‌ی گردگار ؛ کەوابوو خودا ئەگەر خۆی شاردەوە لە هەندێ کەس ئەوە ئارەزووی خۆیەتی‌و کەس دەسەڵاتی بەسەردا نیـــە ئەگەر خۆیشی دەرخست بۆ هەندێ کەسانی‌تر ئـــەوە جگە لــە فـــەزڵ‌و گەورەیی‌ی هیچی تێدا نیە •

لێرەدا مەولەوی‌ی ئەوەی مەبەستی بوو سەبارەت بە ناسینی خـــودا بـــەم شێوە شـــیعرییـــە ، لـــە سۆفیگـــەری‌ی وەرگێـــراوە باس، کـــرد ، لێرەودوواش ئەیەوێ لـــە تەواوی‌ی سیفات‌و ناوەکانی خودا بدوێ لەسەر هەمان ڕێبازو ئەڵێ :ـ

**هەر وەها صیفات مەظهەرن بۆ ذات**
**ئەسمایچ مەظهەرن یەك یەك بۆ صیفات(٢٦٤)**

هەر وەکوو سیفاتەکانی خودا دیاردەن‌و بۆ زاتی موبارەکی هەرووەها ناوەکانیشی دیاردەن بۆ سیفەتەکانی ، جا با بزانین ئەمە چۆنە :ـ

**بۆ هەر یەکێکیچ لە ئەسمای حوسنا**
**موقەددەری کرد یەکێ لە ئەشیا(٢٦٥)**

**کەوا لاییق بێ بەو مەظهەرییە**
**بەو ئایەنەی ئەو ئیسمی عەلییە(٢٦٦)**

بەرانبەر هەر یەکێ لەناوە جوانەکانی خودا ، شتێکی داناوە کە شایستی ئەم دیاردەییەو ئاوێنەی ئەو ناوە بەرزە بێ ، جا بۆ چاو ڕوونی ئەم وێنە ڕەچاوکە :

**کردی بە مەبدەء لە بۆ ئەو شەیئە**
**ئەو ئیسمە خۆرە ئەو شەیئە فەیئە(٢٦٧)**

---

(٢٦٤) مەظهەر ( مظهر ) : شوێنی دەرکەوتن یا موظهیر ( مُظهِر ) : دەرخەر • ئەسمایچ : ناوەکانییش •

(٢٦٥) حوسنا ( حسنی ) : جوان ، جوانترین لە ئایەتی ( ولله الاسماء الحسنی فادعوه بها ••• ) وەرگیراوە • موقەددەر ( مقدر ) : بڕیاری دروست‌کردن دراو • ئەشیا ( أشیاء ) : کۆی شەیئە ( شيء ) : شت ، بوونەوەر •

(٢٦٦) لاییق ( لائق ) : شاییست • مەظهەرییە ( مظهریه ) : بوون بە شوێنی دەرکەوتن یا موظهیرییە ( مظهرية ) : بوون بە دەرخەر • دەرخەرێتیی • ئایەنە : ئاوێنە • ئیسمی عەلییە : ناوی بەرز •

(٢٦٧) ئەو شەیئە : ئەو شتە کەوا شاییستی دیارەدەیی بێ • خۆر :

موستەعیدد دەوێ بەو ئیسمە ئەو شەی
بەو ئیسمە دەکا حەمدو شوکری حەی(٢٦٨)

زبانێکی پـــاك مەلەکووتی‌ی هـــەس
پێی دەکـا تەسبیح جەنابی ئەقدەس(٢٦٩)

ناوی خۆری کرد بە مەبدەء بۆ سێبەر ، سێبەر ئامادە ئەبێ بە هـۆی ناوی خۆرەوە ، بەو ناوە سوپاس‌و ستایشی خودا دەکات زمانێکی خاوێنی مەلەکووتی‌ی هەیە ، زیکری جەنابی ئەقدەسی پێ‌دەکات ئەنجا مەولەوی‌ی باسی پایەی ئەو ڕێڕەو ( سالك )ەت بۆ دەکات کە سەر لەم دۆخ‌و بارە بداو لەم شتانە ئاگاداربێ :

---

ڕۆژ ، ئـەو کۆ کازە ئێجگار گەرم‌و ڕووناکەی هۆی ژیانمانە . فەیء : سێبەر لـەم بەیتەدا لێلێییەك هەیە : ئەگەر خـۆر ناوی شتەکەیە ئەی موسەمماکەی فەیء لە کوێیە ؟! .

(٢٦٨) موستەعیدد ( مستعد ) : ئامادە . حەمدو شوکر : ســوپاس‌و ستاییشی . حەی ( حی ) : زیندوو مەبەست خودایە چونکە هەر ئەو پڕ بەپڕی هەموو کات‌و ماوەیەك زیندووە . بـەو ئیسم : بــەو ناوە ، ئەم ناوە ئەبێ بــە چ زمانێك بێ ، ئایا هەموو زمانەکان لەبەردەم خوددا یەکسان نیین ؟!! .

(٢٦٩) مەلەکووتی‌ی ( ملکوتی ) : نیسبەتە بۆ مەلەکووت ( ملکوت ) : جیهانی : گیان ، واتا . تەسبییح ( تسبیح ) : گوتنی ( سبحان الله ) ، زیکر کردنی خوداو ناو بردنی بە پاك‌و خاوێنی‌ی . جەناب : نزیکی‌ی ، شـــوێنی نزیك ، بۆ ڕێز بەکـار دێنرێ . ئەقـدەس ( اقدس ) : خاوێن‌تر لە هەموو شت ، مەبەست خودایە .

**که پێی عەطا کرد ئـەم مەظهەرییە**
**بۆ وەصفی جـــەمال یا جەلالییـــــە(٢٧٠)**

**دەلیلی ئـەهلی حـــالەو موتتـەضیح**
**( وان مـــن شـــیء الا یســـبح )(٢٧١)**

هەر کەسێ خودا ئەم دیاردەی وەسفی جوانـکاریی یـا توندییەی پێبەخشیی ، ئەوە بەلگەی ئەوەیە چووەتە ڕیزی ئەهلی حالەوەو ئاگای لـە زیکرو تەسبیحی هەموو شتێك هەیە ، ئەو کاتە لە ڕاستیی‌و نهێنیی ئـەم ئایەتە ئەگات کـە بڕیاری زیکرو تەسبیح بۆ هەموو شتێك دەدات زیندەوەر بێ یا بێ گیان ، درەخت بێ یا دارو بەردو گڵ ..

---

(٢٧٠) عەطا ( عطاء ) : بەخشیین . وەصفی جەمال : ئەو وەسفانەیە کە واتای جوانکاریی بگەیێنن ، نەرمیی‌و بەزەییان لێ بوەشێتەوە . وەك : ( رحیم ، ودود ، ... تواب ) .
وەصفی جـەلال : ئـەو وەسفانەی خودایە کـە واتای توندیی‌و گەورەییی‌و دەسەلاتیان لێدەر کەوێ ، وەك : ( الجبار ، المنتقم ، العزیز ... ) .

(٢٧١) دەلییل ( دلیل ) : نیشانە ، بەلگە . ئەهلی حال : ئەوانەی لە تێگەیشتندا پێویستیان بە وتەو هێمای هەستە دیارییەکان نییە . موتتەضیح ( متضح ) : دەرکەوتوو ، ئاشکرا . ( وان من شيء الا يسبح بحمده ولكن لا تفقهون تسبيحهم ) ، ئایەتی (٤٤) لەسوورەی ( الاسراء ) واتە : هیچ شتێ نییە زیکرو تەسبیحاتی خودا نەکات بەلام ئێوە لێی ناگەن .

( فبتقدير العــزيز الخبير
الأشيا طــرأ كانت مقادير(٢٧٢)

لأســـــمائه وصـــــفاته
تجلت فيهـــا لا لذاتــه )(٢٧٣)

خودای خاوەن دەسەڵاتو شارەزا وای بڕیار داوە کە شتان هەموویان دیاردەی ناوو سیفەتەکانی بن نەك دیاردەی زاتی پاکی چونکە :

جێی نییە جیلوەی ذاتی بـــە تاقی
ســـەر دڵی موئمین فـــانیو باقی(٢٧٤)

جیلوەگاو دیاردەی زاتی خودا بەڕاستیی هەر دڵی خاوەن باوەڕی بـە لەش بەفەناداچووو بە گیان جاویدە •

لێرەدا جێی ئەوەیە گومان ببرێ کە مەولەویی بیرو باوەڕی وایـە دڵـی خاوەن باوەڕ ڕاستییو نهێنیی زاتی خودای لـێ ئاشـکرا دەبێ ، لەبەر ئەوە دێ ئەو گومانە پەرت ئەکاو ئەڵێ :

---

(٢٢٧) فبتقدیر العزیز الخبیر : بـــە بڕیار دانی خودای بەدەســـەڵاتی شارەزا • الأشیا طرأ کانت مقادیر : هەموو شتان بەگشتیی ، ئەندازەو دیاردەن •

(٢٧٣) لأسمائه وصـــفاته : بۆناوو سیفەتەکانی • تجلت فیهـــا : لـــەو شتانەدا ناوو سیفەتەکان دەرکەوتوون • لا لذاته : ئەندازەو دیبارده نیین بۆ زاتی خودا ، واتە خۆی لەو شتاندا دەر ناکەوێ •

(٢٧٤) تاقیی ( تحقیق ) : ڕاستیی • سەر : مەگەر • فانییو باقیی : بە هیلاکدا چوو بە لەشو ماوە بەگیان •

دەرکی دڵی خەڵق هەر دادەمێنێ
هەر خۆی لەبەر چاو خۆی دەنوێنێ(٢٧٥)

عاریف هەر خۆیەو مەعروف خۆیەو بەس(٢٧٦)
مەعریفەتی حەق بۆ کەس نادا دەس

زانینی دڵی خەڵك بڕ ناکاو داماوە لـە ئاستـی ناسینی ، تەواوی خودادا، هەر خۆی لەبەر چاو خۆی دەنوێنێو هـەر خۆی بە تـەواوی خـۆی دەناسێ کە وابوو خودا ناسی ڕاستەقینە هەر خۆیەو ناسراویش هـەر ئـەوە(٢٧٧) بەڵێ ناسینی ئـەو زاتە ڕەوایە ، لـە هیچ وەرزو کاتو شوێنێکدا بۆ کەس دەست نادات ٠

لێرەدا هەر چەند ئەگەر مەولەویی کۆتایی‌ی بە باسـەکە بهێنایەو دووا بەیت ( نیزاع بڕیاوە ٠٠٠٠ )ی بە دووا ئەمەدا بهێنایە هەر جـوانو دڵگیر ئەبوو بـەڵام وا دیارە ویستوویـەتی ئەم مەبەسـتانەش لە گـەڵ کۆتاییەکەدا ڕەچاوکا :ـ

---

(٢٧٥) دەرك ( درك ) : زانیین ٠ هەر دادەمێنی : بڕ نا کاتە ناسیینی ڕاستی‌ی خـودا ٠ دەنوێنێ : دەردەکەوێ بـە هـەموو جوانی‌و تەواوییەوە ٠

(٢٧٦) عاریف ( عارف ) : بناس ، ناسەر ، بەعرووف ( معروف ) : ناسراو ٠ مەعریفەت ( معرفة ) ناسیین ٠

(٢٧٧) مەبەستی مەولەوی‌ی لێرەدا ئەوەیە ، لەم مەسەلەدا تەنها ناسراوی خودا خۆیەتی چونکە ناسراوی ئێمە لە هەموو ڕوویەکەوە ئەو نییە : ( كل ما خطر ببالك فالله بخلاف ذلك ) هەر چی‌ی بە دڵتدا بێت خودا جیاوازە لەوە ، ئەش بێ مەبەستی ئەوە بێ شایستی ناسیین هەر خودایە ٠

یەکەم : کۆتاییەکە پەیوەندکانەوە بە سەسەلەی چارەنووسەوە کـە کوتاییی باسەکانی هۆنراوەکەیە •

دووەم : بە هێماو ڕەمز دەم بدا لە فەنای خۆی ، وەك قۆناخێ لـە گەشتە سۆفیگەرییەکەیدا • سێهەم : بـەو بۆنەشـەوە نازناوو مۆرکی تایبەتیی خویشی لێدا ، لەبەر ئـەم مەبەسـتانە ئـەم دوو بەیتەی لێـرەدا تێهەڵکێش کردو وتی :ـ

**صـیدقی قەضییەی موجیبە ڕاسـە**
**موقتەضیی وجـوود مەوضووعە واسە(۲۷۸)**
**تۆ خۆ مەعدوومیی هەر نا دیاریت**
**نە موختاریت ڕاس ، نە لاموختاریت(۲۷۹)**

---

(۲۷۸) صیدق ( صدق ) : ڕاستیی ، جووت بوونی چـەمکی ڕسـتەی گێڕاوەییی : ( قضیه ) لەگەل ڕووداودا • قەضییەی موجیبـە ( القضية الموجبه ) : ئەو ڕستەی فەرمانی تێدا ئەدرێ بە بوونی شتێك بۆ شـتێکیتر ، شتی یەکـەم پێی دەڵێن : ( موضوع ) : دانراو ، پالپشت ، شتی دووەم پێی دەڵێن ( محمول ) : بارکراو ، بار ، پالدراو ، وەك بلێی : مرۆف زۆر لێکـــراوە ، ( مرۆف ) مەوضوعە ، ( زۆرلێکراو ) مەحمـــوولە • موقتـەضیی وجـــوود مەوضووعە : پێویستی بە بوونی دانراوەکە هەیە ، چونکە ئاشکرایە ئەگەر شتێ خۆی نەبێت هیچیشی نییە • واسە : وایە ، واتە شتێکی ئاشکرایەو گومانی تێدا نییە •

(۲۷۹) تۆ خۆ مەعدوومیی نا هەر دیاریت : خـۆ ئەی مەعدومیی نا دیاریتو هەرچیی نادیارییش بێ نییە ، یا تۆ خۆ نییتو دیاریی نییت • نە موختاریت ڕاس نەلا موختاریت : واتە ئیتر نـە ئەتوانیی بلێی من زۆر لێ کراووم نە من هەڵبژێرم بە پێی یاسای پێشوو کەوابوو ئەم قییلو قالوبگرەو بەردەیەت کە پەیوەندی بە خۆتەوە نەبێ لە چییە ؟!

قەزیەی موجبە بە پێی زانیاریی مەنتیق پێویستی بە بەبوونی مەوزووعەکەی هەیە ، خۆ تۆ ئەی ( مەعدوومی ) ! بوونت نیە ، کە واو ئەگەر بڵێی من هەڵبژێرم و ئارەزووکارم یا من زۆر لێ کراووم هیچیان بۆ تۆ ڕاست نیە ، چونکە تۆ خۆت نیت ، کە نەش بوویت نە ئەوانەو نە هیچی تریشت بۆ ئەبێ ، جا ئیتر ئەم درێژەدانەت بە باسی چارەنووس کە پەیوەندیی بەخۆتەوە نەبێ لە چیە ؟!

کەوابوو چاك وایە لەمە پتر نەدوێین و کۆتاییی بە وتار بەم بەیتە بهێنین :-

## نیزاع برِیاوە دەگەڵ خاص و عام
## ( صح العقیدة وتم الکلام )(۲۸۰)

بەڵێ وا لێرەدا کێشە لەگەڵ ئەهلی دڵ و زانیارە کەلامیەکاندا هیچ نەبێ بە پێی بۆچوون و دڵ پێداهاتنی خۆمان بڕایەوە • بیرو باوەڕ ڕاست بووەوەو وتاریش کۆتاییی هات •

---

(۲۸۰) نیزاع ( نزاع ) : کێشە ، خیلاف • خاص : تایبەت ، مەبەست ئەهلی دڵ و پیاوانی نزیك لە خودان • عام : گشتیی ، مەبەست زانا سەرزارەکییەکانی زانیاریی کەلامە ، وەك موعتەزیلەو ئەشعەرییەو ••• صح العقیدة وتم الکلام : بیرو باوەڕ ڕاست بووەوە ، وتاریش کۆتاییی هات • وەکو وتمان ئەم مەسرەعە بە حیسابی جومەل ئەکاتە : (۱۲۸۱)ه ئەگەر (ة)ی ( العقیدة ) وەك (ت) دابنرێ ، ئەمەش بەرواری کۆتاییی هێنانی هۆنراوەکەیە هەر وەکو تێپەڕی •
کۆتاییی هات لە شەوی (۱٤)ەی ڕەمەزانی (۱٤۰٤ك) ڕێکەوتی ۱۳/حوزیرانی ۱۹۸٤ز •

# سەرچاوەکان : ( المصادر )

هەرچەند گەلێ سەرچاوە لـە پێکهێنانی ئەم بەرهەمەدا بەشدار بوون بەڵام زۆربەی لە پەراوێزە دەستنووسەکانی مەولەویی‌خۆیـەوە کـە ووسیوە ، یـا لـە ڕاوێژی شارەزابانی لەم بوارەدا متمانەپێ‌کـراو یـا لـە زەینکاریی تایبەتی خۆم وەرگیراوە •

لێرەدا تەنها ناوی هەندێ لەو سەرچاوانە بۆ دەست‌نیشـان‌کردنی جۆرو پێ‌زانینی سوود لێ‌وەرگرتنیان دەخەمەڕوو •

هیوام وایـە خوێنەر ؛ چونکە من لـە باسە تایبەتەکاندا کـەم‌تـر هێنام بۆ سەرچاوە کردووە ، بـە پێی خەملاندنی خۆی ، لەکاتی پێویستدا بۆ سەوچاوە لەگەڵ مەبەستدا گونجاوەکان بگەڕێتەوە ئەو سەرچاوانەش ئـەمانەن :ـ


١ ـ دیوانی مەولەویی : مەلا عبدالکریمی مدرّس • بەغدا/١٩٦١ •

٢ ـ یادی مەردان ، بەرگی دووهەم : مەلا عبدالکریمی مدرس • بەغدا/ ١٩٨٣ •

٣ ـ مەولەویی : أ • ب • هەوریی • سلیمانی/١٩٧٣ •

٤ ـ الوسیلة في شرح الفضیلة : الشیخ عبدالکریم المدرس بغداد/١٩٧٢

٥ ـ التعریفات : لعلی بن محمد الجرجانی المعروف بـ (السید الشریف)•

٦ ـ شرح العقائد النسفیة : لمسعود بن عمر المعروف بسعدالدین التفتازاني •

٧ ـ تعلیقات أحمد بن موسی الشهیر بالخیالی علی شرح العقائد النسفیة للسعد التفتازاني ح وحواشي عبدالکریم بن شمس‌الدین المعروف بالسیالکوتی علیها •

٨ ـ شرح تهذيب الكلام للشيخ عبدالقادر المهاجر وتعليقـات العلامتين : الملا عبدالرحمن البنجويني والشيخ عمـر الشهير بأبن القرهداغـى على الشرح المذكور .

٩ ـ الأعلام : خيرالدين الزركلى .

١٠ـ المنجد في اللغة والأعلام الطبعة الحادية والعشرون .

★ ★ ★

## پێرستی پێشەکیی و لێکۆڵینەوەی
## هەڵبژاردەی ( العقيدة المرضية )

| لاپەڕە | بابـــەت |
|---|---|
| ٤٠ | مەرجی جێگرتنی ئیمان لە دڵدا . |
| ٤١ | ڕێەکانی کەسب کردنی ئیمـــان : ( کەشف ، دەلیل ، تەقلید ) .. |
| ٤٤ | سەرچاوەکانی مەونەویی و سوڕانەوەی لەگەڵ ڕاستییدا . |
| ٤٦ | شـــێخ ( عبدالرحمان )ی ( ابو الوفـا )و بەرواری دەست پێ کردن و کۆتایی کتێبەکە . |
| ٥٠ | کورتە باسێکی بوون ( وجود ) . |
| ٥٢ | چوونە ناو باسی یەکێتیی ( وحدة )ەوە . |
| ٥٤ | هاتنـــە سەر مەبــەست و شێوازی دوانی مەونەویی لـــە هۆنراوەکەیدا . |
| ٥٥ | باســـی ئیمان و لێکـدانەوەی سوورەتی ( اخلاص ) ، بـــۆ لێکۆڵینەوەی چۆنێتیی خوداو باسی سیفەتەکانی . |
| ٥٨ | دەرهێنانی ڕای ڕاست لـــە بابـــەت چارەنووسەوە ( مسألة |
| ٦٠ | باسی ( ازلیة )و ( ابدیة )ی خودا بە شێوەیەکی ناسك و داهێنراو . |
| ٦٢ | ئاوڕێك بـــە لای بەڵگەی ئەهلی دڵدا سەبارەت بـــە خـــودا ناسین . |
| ٦٥ | دیاریی کـــردنی سنووری بیابانی خوداناسیین بـــە پێی دواترین ڕای فەیلەسووف و زاناو خاوەن دڵەکان . |
| ٦٨ | باسی لە دایك بوونی پێغەمەر (د.خ) بە شێوەیەکی زۆر ناسك و پڕ هێماو شاعیرانە . |
| ٧٣ | باسی هاتنی نیگا بۆ پێغەمەر بە هەمان شێوەی پێشوو . |
| ٧٦ | جوانترین پێشەکیی بۆ چوونە ناو باسی میعراج . |
| ٨٠ | هـــەڵوەشاندنەوەی ڕای فـــەلسەفەی کـــۆن سەبارەت بـــە میعراج . |
| ٨١ | چوونە ناو باسی شەوڕەویی و درێژەدانێکی جوان سەبارەت بە چۆنێتی ڕوودانی . |
| ٨٤ | دوانێکی پڕ سۆزو عیرفان لە میعراج . |

| لاپەڕە | بابـــەت |
|---|---|
| ٩٣ | کـورت کردنەوەی چیرۆکی میعراج لـە دوو بـەیتدا بـە شیۆەیەکی بێ وێنەو داهێنراو ۰ |
| ٩٥ | دەمـەتەقێیەك لەگـەڵ تەلکـران‌و تێگـەیشتنی کـەسانی هاوچەرخدا ۰ |
| ٩٨ | بەرهەمەکانی میعراج سەبارەت بە پێغەمەرو کەسانی‌تر ۰ |
| ١٠٠ | کـۆتاییی باسـی ڕێبـازەکانی سۆفییگەریی بـە شـێخ (عبدالقادر)ی گەیلانیی‌و ئیمامی ڕەببانیی ۰ |
| ١٠١ | باسی مەولاناخالیدو شێخ (عثمان)ی (سراج‌الدین) ۰ |
| ١٠٧ | ناوی (شێخ عثمان) بە شیۆەی موعەمما ۰ |
| ١٠٩ | لێدوانێکی تر لە شێخ (عثمان)ی تەوێڵە ۰ |
| ١١٢ | باسی چوار کوڕە ڕابەرەکەی شێخ (عثمان) ۰ |
| ١١٧ | بەراوردێك لە نێو مردن‌و ژیاندا ۰ |
| ١٢١ | نیشانەی دواڕۆژی بچووك (مردن) سەبارەت بە خۆمان بـە شیۆەیەکی شیعریی ۰ |
| ١٢٢ | هەڵوەشاندنەوەی ئـەو بیرو ڕایەی لەگـەڵ سزادانی نـاو **گۆڕدا نییە ۰** |
| ١٢٥ | توێژانەوەی ڕای فەیلەسووفەکان سەبارەت بە پاڵدانی هەموو ڕووداوێك بە خوداوە ، چیرۆکێکی دلگیر لە ئەفلاتوونەوە ۰ |
| ١٢٨ | پەسـەند کـردنی بیرو ڕای ئەشعەریی لـە چارەنووس‌و مەسەلەکانی تری بڕوادا ۰ |
| ١٣٠ | دەمەتەقێیەك لەگەڵ ئەوانەدا چارەنووس ئەکەن بە بیانووی **گوناه کردن ۰** |
| ١٣٢ | تۆبەو کۆتاییی ژیان ، وەك ڕچـەشکاندن بۆ چـوونە نـاو کۆتاییی باسی چارەنووس‌و هۆنراوەکەشەوە ۰ |
| ١٣٣ | لە ئەستۆ گرتنی فەرمانە سەر زارەکییەکانی ئاینی ئیسلام ۰ |
| ١٣٤ | گەشتێکی سۆفییگەریی زانایەکی سەرزارەکیی سەرگەردان لە ناو چۆڵی : قیبل‌و قالدا ۰ ( بە شیۆەی هێماو ڕەمز ) ۰ |
| ١٣٤ | ئەو کۆسپانەی هاتبوە ڕێی زانا سەرگەردانەکە ۰ |
| ١٣٥ | دۆخی تێگەیشتن دوور لە ڕاستیی زاناکە ۰ |

- ئەگەر دەتەوێ شیعری مەولەوی بێ وەرگێڕانو دەسکاری بەشێوی سۆرانی بخوێنیتەوە ·
- ئەگەر بە ئاواتی ئەوەی وێژەی سۆفیگەری بە زمانە شیرینەکەی خۆت بخوێنیتەوە ·
- ئەگەر دەتەوێ بە سەر ئەو پردە بەرزەدا ، کە مەولەوی لە ناوەند زانیاری کەلامو سۆفیگەریدا بە ستوویە ، گەشتێکی گیانی بکەی ·
- ئەگەر دەتەوێ سوود لە باوەڕی بەرزی مەولەویو هێزی نیدای گیانی پاکی وەرگری ·
- ئەگەر دەتەوێ دەربارەی :

باوەڕو پلەکانی ، یەکێتی خودا ، چارە نووس ، ڕۆژی دوایی ، ناردنی پێغەمبەران ، نیگاو میعراج ، زنجیرەی ڕێبازی سۆفیگەری ، شێخ وەسمانی تەوێڵەو چوار کوڕە ڕابەرەکانیو گەلێ مەسەلەی گرنگی تر ، بەو شێوە ناسکە پڕ هێماو ڕەمزەی مەولەوی بخوێنیتەوە ·
هیوام وایە بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە تامەزۆت بشکێو بە ئامانجەکانت بگەی ·

**بابەعەلی شێخ عمر قەرەداخی**

نرخی ۱۰۰ر۱ فلسە